حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی رۆشنبیری
بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە
زنجیرە (٣٦٥)

# فەرهەنگی ئیدیۆم لەزمانی کوردیدا

عەبدولوەهاب کانەبی شەریف

سلێمانی ٢٠٠٥

# فەرهەنگی ئیدیۆم
# لەزمانی کوردیدا

نووسینی: خەبات عەبدوڵڵا

بابەت: فەرهەنگ

کۆمپیوتەر: مەهدی ئەحمەد

هەڵەبڕی: نووسەر

سەرپەرشتیاری چاپ: سەلام فاتح

نەخشەسازی بەرگ : ڕیاری جەمال

چاپ: چاپخانەی ڕوون

تیراژ: ١٥٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن: (٦١٥)ی ساڵی ٢٠٠٥ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە

www.roshnbiri . org

## سوپاس نامە :-

سوپاس و رێزم ئاراستەی هەموو ئەو بەڕێزانە دەکەم کەلە بەچاپ گەیاندنی ئەم فەرهەنگەو هەردوو فەرهەنگەکەی تر درێخیان نەکردوو دەستی یارمەتیان بۆ درێژ کردرێزو نەوازشم هەیەبۆیان

١- سوپاسی بەڕێز.وەزیری ڕەوشەنبیری ئیدارەی سلێمانی کاك {فەتاح زاخۆیی} دەکەم.کەبەوپەڕی ڕێزو ئیحترامەوەپێشوازی لەم بابەتە گرنگە کرد

٢- زۆر سوپاسی برادەران (کاك محمد گەردی)و مامۆستا (محمد مەلا کەریم جوکل)و (کاك محسن ئاوارە) دەکەم کە ماندوو بوونیان زۆر چەشت لە بەچاپ گەیاندنی- هەر سێ فەرهەنگ

٣- سوپاسی بێ پایانم بۆ هەموو برادەرانی دەزگای چاپی وەزارەتی ڕەوشەنبیری سلێمانی دەنێرم کە بەڕاستی پێوە ماندوو بونەوە بەتایبەتی (کاك سەلام و پەیمان رەزا)و دەزگای کۆمپیوتەرو تەصمیم و چاپ کەرەکان هیوادارم لە خەباتی نەپساوەی ڕەوشەنبیری کوردی ماندوو نەبن لەگەڵ ڕێزم دا.

براتان

عبدالوهاب کانبی شریف

هەولێر/ بەرواری ٢٠٠٥/٣/١

## پێشەکی :

کارێکی گەورە لە باسی ئیدیۆم لە زمانی کوردیو لە فەرهەنگ نووسیی کوردا لێکۆڵینەوەی ئیدیۆمی زمانی کوردی باسێکی نوێیەو تاکو ئێستا شتێکی ئەوتۆی دەربارە نەنووسراوە. لەنێو ئەو کارانەی لەم کێشەیە دواون کتێبی (مەکسمی خەمۆ) وتارێکی (یو.یو ئاڤالیانی) کە بە زمانی رووسی نووسراون بە تایبەتی... دیارن هەروەها مامۆستایان تۆفیق وەهبیو قەناتی کوردۆو چەرکەزی بەکۆ.. لە فەرهەنگەکانیاندا هەندێ ئیدیۆمیان تۆمارکردووە. مامۆستا صادق بەهائەددین ئامێدیش لە ساڵی (١٩٧٣)دا لە بەغدا کتێبێکی گەورەی بەناوی ئیدمیت کوردی بڵاوکردۆتەوە ........ زۆربەی ئیدیۆمەکان مانایان باش لێك نەدراوەتەوە بێ گومان هۆی کەموکورتیو ئاڵۆزی ئیدیۆم نەبوون یا کەمیی لێکۆڵینەوەی تیوری ئیدیۆمە لێکۆڵینەوەی قوڵو تەواو لە ئیدیۆمی زمانی کوردی مەودای ساغ کردنەوەی گەلێك کێشەی گرنگو ئاڵۆزی وشەو دەستەواژەو ڕستە ئاسان دەکاو زەمینەی ڕێك خستنی فەرهەنگ تەخت دەکا.

لەزمانی کوردیدا – وەك هەر زمانێکی دیکەی سەر ئەم زەمینە جگە لە ووشەی جیاجیا، کەدانەی زمانن، هەروەها پێکهاتنی ئاڵۆزیش هەیە کەپێی دەوترێ ئیدیۆم.

جا لێرەدا ئەمە بەشێکە لە نووسینی مامۆستا ئاورەحمانی حاجی مارف دەربارەی ئیدیۆم لە کاری فەرهەنگ نووسیندا.

ئەوەی من لێرەدا دەمەوێ بە خوێنەری رابگەیەنم. ئەم پەرتووکەیە کە لە ئیدیۆم پێك هاتووە، هەمووی ئیدیۆمە کە دەمەوێ مانای ئیدیۆم بە ساکاری بە تۆی ڕابگەیەنم، لە ئیدیۆمدا ووشەیەك چەند ووشەیەك یان ڕستەیەك دوو مانا دەبەخشێ یەکەمیان مانای ڕاستەقینەی خۆی دووەم مانای (مەجازی) کە پێی دەڵێن ئیدیۆم بۆ نموونە دەڵێن (کەر) واتە ١- ئاژەڵێکە. ٢- لە واتای (بێ عەقڵی) بەکاردێت ئەمە دەبێتە ئیدیۆم ئێمە لە ئیدیۆم مەبەستمان مانا ڕاستەقینەکە نییە بەڵکو بۆ سەلماندنی قسەیەكو کاروکردەوەیەك بە مانای مەجازی بەکاری دەهێنین. دروست بوونی ئیدیۆم پاش تاقی کردنەوەیەکی یەکجار زۆرو لێکۆڵینەوەو سەنگو سوژن کردنی ووشە ڕاستەقینەکەو دڵنیابوون لە دروست بوونی واتا مەجازیەکە ئینجا بوەتە ئیدیۆم.

زمانی کوردی لە ئیدیۆم زۆر دەوڵەمەندە چونکە لە رووی سروشتیەوە کوردستان وڵاتێکی جوانەو پڕدارو بارو چیاو هەڵدێرە ئەمەش بە شێك لە ئیدیۆمی دروست کردووە وەك دەڵێن بوونە چیا لە پشتم واتە زۆر قورسو گران بوە چیام لە پشتە واتە خاوەن پشتیوانم... هتد لەڕووی رزاعەتەوە دەوڵەمەندە بۆیە زۆر بابەتی کشتوکاڵی

بومته ئیدیۆم ومیا چەوسانەوه وای کردووه ئیدیۆم دروست ببێ لەم خاڵانەی خوارەوه هەندێ ئیدیۆم شی دەکەمەوه بۆ لێ حاڵی بوونی ئەم پەرتووکە:

١- میللەتەکەمان ئاژەڵی بەکارهێناوه بۆ ئیدیۆم وەك

ڕێوی: واته فێڵباز ، مەڕ: واته فەقیر ... هتد

٢- ئەندامی لەشی مرۆڤ زۆر زۆر بۆ ئیدیۆم بەکارهاتووه وەك

دەست کورت: فەقیرو نەدار، چاوقایم: واته ئازا، دڵ تەنگ: واته عاجز

٣- گیاو گوڵو شینایی بەکارهێناوه وەك

تەرەماش: بێ نرخ، گوڵه بەڕۆژە: هەڵپەرست

٤- هەر شتێك که بایەخی هەبووبێ له ئیدیۆم بەکارهاتووه

٥- زۆر ووشەی ئیدیۆم هەیه هاو واتان واته یەك مانایان هەیه وەك (ئابرو، ئابڕوروو، ڕەونەقی روو، ورشەو گورشەی دەموچاو، شەرم، حەیا، ناموس، حورمەت، شورەیی، ڕێز، مەیشۆ) یان (ئاگر کەوتنه گیان، ئاگر تێ بەربوون، ئاگر گرتن) جا ئەم فەرهەنگه لەو بابەتانەی واتای هاواتای زۆر تێدایه

٦- زۆر ئیدیۆمی وا هەیه یەك (ئیدمه) بەلام زۆر واتای هەیه بەلام زۆربەیان واتاکانیان به ژماره (١-٢-٣) نەنوسراوه ووشەکه (ئیدمەکه) دووباره بوویتەوه وەك (ئا- بەڵێ) ئا- ڕاسته (ئا- بەو جۆره) یان (ئاخر شەڕ چاره ڕەش) ئاخر شەڕ- پیری بەدفەڕی نەگریس یان (تێر- زۆر) تێر- دەوڵەمەند (تێر- زۆر بەدڵ)

٧- له نێوان دوو ئیدیۆم بۆ جیاکردنەوەو تێکەڵ نەبوون (-) داش یان (،) فاریزه دانراوه

٨- زۆربەی ئیدمەکان ڕستەیان دەستەواژەم بۆ هێناوه بۆ زیاتر روون بوونەوه

جا خوێنەری بەڕێز لەم کورتەیەدا بەشێکی زۆر بچووك له ئیدیۆم باس کراوەو پەرتووکیش که ناوم ناوه (فەرهەنگی ئیدیۆمی کوردی) لەبەر دەستیایه گەر هەڵەشی تیابێ کاری تەنیا کەسی بێ هەڵه نابێو بەلام تۆ لەسەر هەڵه بازمەده با مەودای ڕەخنەگرتن فراوان بێتو لێکۆڵینەوەو ڕەخنەگرتن بابەتەکه به پێز دەکاتو زیاتر ڕوونی دەکاتەوه.

نووسین و ئامادەکردنی
عبدالوهاب کانبی شریف شێخانی
هەولێر- تەیراوه

# ئـــــا

ئا: بەڵێ-

چوویت بۆ بازاڕ؟ ئا

ئا- ڕاستە

ئازاد کوڕێکی زیرەکە، ئا؟

ئا- بەو جۆرە

ئا، ئاوا کۆتایی بەکارەکەی هێنا

(ئابڕوو- ئاوڕوو- ئاڤڕوو- ڕەونەقی ڕوو- ورشەو گەشەی دەموچاو)- شەرم، حەیا، نامووس، حورمەت، شوورەیی، ڕێز، حەیشۆ

(بێ نرخە ڕیش و ڕوو کە نە ڕەنگی بە ئابڕوو)

" بۆرینە - ١ -"

نەوزاد زۆر بە ئابڕووە — واتە زۆر بەشەرمە

خال -ل٤٠

( ئابڕووبران- ئابڕووچوون- ئابڕوو تکان- ئابڕوو ڕژان)- بێ ری ز بوون، بێ حورمەت بوون، سووک و ڕیسوا بوون لەناو کۆمەڵدا. بێ نرخ و حورمەت بوون لەبەر چاوی خەڵك

ئاری - ل٣٦- ل٣٧

ئابڕوو براو- ڕیسواکراو، ناوزڕاو، بەدناو کراو

ئابڕووبردن- بێ قەدرو حورمەت کردن و سووک و چرووک کردنی یەکێك، بێ شەرەف کردن، ڕیسواکردن، ناوزڕاندن، بەدناوکردن، شەرەف شکاندن - زەبیحی- ل٣)

ئابڕووبردن- ناوو ناتۆرە شوێن خستن، سووک و چرووک کردن، ( )- ٢٢، قسەی خراپ کردن لەدوای کەسێ بەمەبەستی ڕیسواکردن

ئابڕووبردن - بێ بن کردن (کچ - بەزۆر) بن ڕژاندن بە دوو کەسان ئابڕووی کچەیان برد

ئابڕووبەرە (١) کەسێك ببێتە مایەی ڕیسوابوون، یەکێك کاری وا بکا شەرەفی یەکێك یا چەند کەسێکی تری پێ بچێ
(٢) کارو کردەوەیێکی پیاو سووك بکا یا عەیبەی بێنێتە سەر
دایکم ! ئام منالە ئابڕوو بەرە لەچی دەگێری، کچی وەرە دانیشە هەی ئابڕووبەرە
زەبیحی- ل ٣
ئابڕوو بلاو - ڕیسوابوو، بە قەباحەت چوو
( ئابڕوو تکاو- ئابڕوو چوو- ئاوڕوو چووگ) - کەسێك نامووسی چووبێ، تووشی سووکیو حەیا چوون بووبێ شەرم نەماو، خەنزار، قیچمەسەر، ئاکار خراپ
" ڕۆژی تەرزە، چەندە مینای دلشکێنو سەرشکێن"
ڕۆژی باران، چەند شرە بێ عیسمەتو ئابڕوو تکاو
نالی ، گم
ئابڕوو خواز - ئەو کەسەی هەمیشە ئاگاداری شەرەفو ئابڕووی خۆی دەکا کە سووكو ڕیسوا نەبێ
ئابڕوودار- ئابڕوومەند- بەڕێز، ڕاستگۆ، بە حورمەت
".... بوێرو چاونەترسو شێرو ئابڕوومەندو جوامێرو ئاکار پەسندو چاوتێر ناسراوە...."
هوز- هەژار -ل٤
ئابڕووداری- ئابڕوومەندی- خاوەنی ڕێزو شەرمەندی، بێ عەیبوعاری
ئابڕوو کڕینەوە : وەسەر نەنگو عەیب دا زال بوون
ئابڕوونەتکان ، ئابڕوونەچوون- شەرم حەیا بەخۆ بوون نامووس نەچوون
ئاتەشپا- بە واتای بەخێراییو پەلە کردنو بێ ئارامی دێت
ئاتە شپارە- زۆر شەڕانی، منالی هاروهاج

منداڵەکەیان چەند شەیتانە هەر ئاتە شپارەیە
(بۆرینە)
ئاتە شپارە- بە پیاوی زۆر زرنگ‌و ئازا لە شەڕو بازرگانی‌دا دەڵێن
فلان لە شەڕدا ئاتەشپارەیە
بۆرینە
ئاتەش پەنجە- بە واتای دەست ڕەنگین‌و شارەزا لە پیشەو چالاك‌و زەبر بە دەست دێت
ئاتە شخور- ستەمکار، زۆردار
ئاتەش دڵ- دڵ ئاگرین- شەیداو خۆشەویستی راستی
ئاتەش زمان- زمان پاراو- زمان ڕەوان - ووتار خوێنێکی کاریگەر
ئاتەشی- بە بنیام توورە ئەیژن، پیاوی زۆر تەند تەبیات، ئینسانی تووڕەو تۆسن، توندە میزاج ئەم پیاوە ئاتەشی میزاجە
زەبیحی-ل٦
ئاتەگ- بنارو دامێنی چیا، لای خوارەوەی شاخ‌و کێو یان گرد
"سوارەکان بە ئاتەگی شاخەکەوە بوون"
زەبیحی-ل٦
ئاخدار- کەسێ خەم‌و خەفەتی هەبێ، خەفەتبار، خەمبار
ئاخ، چراخ، چ ئاخ؟ ئاخ بەی ئاخداری
چون من خاترخار، خەمبار، داخداری
مەولەوی
ئاخرین- بە مرۆی ژیرو زیرەك دەڵێن
"کاکت چاك لە دنیا دەزانێ ئاخر بینە"
ئاخر زەمان- ڕۆژگاری ناخۆش‌و پڕئاژاوە کە کەس ئاگای لە کەس نەبێ‌و هە رکەسە دەهەوڵی خۆیدابێ
ئەی خودا لەو ئاگر بارانە، ئەی خوا لەو ئاخر زەمانە
ئاخر شەڕ- پیری بەدفەڕی نەگریس

پیری ئاخر شەڕ وەتەنت فرۆشت/ ئابڕووت گۆڕیەوە بە پڵاوو گۆشت
هەژار- بۆرینە
ئاخر شەڕ- چارە ڕەش، کەسێ کە لە دوایی تەمەنی خۆیدا تووشی بەڵاو ناخۆشی و هەژاری هاتبێ
ئاخە رەش- بێ نەوا، هەژار. بەلەنگاز، ژار ، بێ بەش لە خۆشی و شادی
ئاخنین- لە ڕووی گاڵتە یا دڵگرانییەوە بۆ زۆر خواردن
ئەرێ ئەحە ئەوە بۆ هێندەی تێ داخنی دەلەی تێرە نەخۆرت گەیوەتێ
ئاخوربەرز- بەدەعیە، بەفین، فیزدار، لەخۆ بایی بوو ، خۆ بەشت زان
ئاخور چەور- دەوڵەمەند، ساماندار، کۆك
کابرا ئاخوڕچەورە کاری لە دەست دێ
ئاخوڕچەوری- دەوڵەمەندی، سامانداری- کۆکی
ئەتۆ ئاخوڕچەوری ئیشت پێ دەکرێت
ئاخور حدود- نەجیم زادە، رەسەن
ئاخوڕ خوار- تەڵەکە باز، بەدنمەك، تەفرەدەر، فریوباز، چەوت و چەواشە گزی کەر
ئاخوڕ خواری- تەڵەکەبازی، بەدنمەکی، تەفەردەری، فریوبازی، گزی کەری
ئارا- حەز، ئیشتیا، حەزکردن لە خواردەمەنی یا هەر شتێکی تر
نەوزاد دەگەل پەنیر ئارای نیە (حەزی لێ ناکاو نایخوا)
کاك هێمن دەگەل مریشك ئارای باشە (حەزی لێ دەکا)
زەبیحی – ل١٢
ئارداوی- ئەو کەسەیە کارێکی نەکردبێ، بەڵام وای نیشان بدا کردویە، ئەو کەسەی لە هیچی نەبوو خۆی تاوانبار پیشان بدات ، تۆمەت بەخۆکردن،
دەڵێن ئازاد دەهیچ دانەبوو بەڵام خۆی ئارداوی دەکا
ئارداویژ- قسەوباس، گفتوگۆ، دەم گفت، دووان، دەراوی دەمی ویژەر
"مام عەولا ئارداوێژی دەمی خۆشە"
ئارداویژ- قسەی هەلەق و مەلەق، ووتەی پڕوپووچ

کاکت ئارداویژێکی ناخۆشی هەیە- واتە دەراوی قسەی هەلەق و مەلەقە دەکات

ئاردی بێژراو- (شت) سازاو، ئامادەکراو، پوختەکراو

ئاردی ناودرکان- بەشتی پەرش و بلاو دەگوترێ کە کۆنەکرێتەوە

ئالۆز- کاری دژوارو گران کە سەروەدەری لێ نەکرێ

کارەکەی لێ ئالۆز کردین

ئاڵۆز- پشێوی و ئاژاوە

دنیایەکی ئاڵۆزە

پیاوێکی زۆر ئاڵۆزو بەد میجازە

بۆرینە -٧

بە قوربانت دەبم ئەی دایکی دڵسۆز

مەبە چیدیکە تۆ دڵتەنگ و ئاڵۆز

هێمن - تاریك روون-ل٨٤

ئارەق- تەڕبوونی لەش لەشەرمان یان لەبەر ماندووبوون

"لە داخی قسە بێ جێیەکانت ئارەقم کرد"

ئارەقە- عارەقە، رەنج، ماندووبوون

ئارەق ڕشتن- هەوڵ و کۆشش و تەقەلادان، رەنجدان، زەحمەت کێشان

چەن خۆشە کوڕم ئارەق برژێنی

لە دەشت و دەرا غیرەت بنوێنی

قانع

(ئارەقی ڕەش و شین دەردان- (١) ئارەقی ڕەش و شین ڕشتن ، ئارەقی ڕەش و شین کردن)- زۆر ماندوو بوون، هیلاك بوون، زۆر خۆماندوو کردنبە ئیش یا قسەو کاری فیکریەوە

تا کتێبخانەکەم ڕێکخست ئارەقی ڕەش و شینم دەردا

تا پرسیارەکەم تێ گەیاند ئارەقەی رەش و شینم کرد

ئارەقە پێ کردن– ئارەق پێ کردنەوە– خەجاڵەت کردنەوەو بەشەرمدا خستنی یەکێك

ئارەق پێ کردن– ترساندنو تۆقاندن، زراو بردن

ئارەق پێ کردن– پارە ئەستاندن لە کەسێ بە نیوە زۆرو نیوە خواهشت

ئیمڕۆ ئازاد ئارەقی بە شێرکۆ کرد پێنج دیناری لێ ئەستاند

ئارەق دەردان– ئارەق کردن– بەخۆدا شکانەوە، خەجاڵەت بوون، شەرمەزار بوون

زۆر پێ تێك چوو. دوای ڕەنگ پەڕینو ئارەقە دەردان پاشەو پاش کشانەوە

بۆرە– ل٨

ئارەق دەردان– پەشۆکان، شڵەژان، تاسان

ئارەقەی نێوچەوان– زەحمەت کێشانی زۆر، ماندوو بوونی زۆر، کەسێ کە ماندوو دەبێ و ئیش دەکات

" بە ئارەقەی نێوچەوانم ماڵو منالم بەڕێوە دەبەم"

ئارەقە نەکردن– ئارەقە نەسڕینەوە– بێ ماندوو بوون، بێ ڕەنجدان

ئازا– خێرا، خۆشڕەو، گورج، بەگوڕ، بەتاو، چاپوك، چوست، چالاك

()– ٦٦

"ئازا بڕۆ، ئازا وەرەوە"

ئازاکە، دەی لە مامت کەوی بڕۆ بەلام ئازا بێیتەوە

زەبیحی– ل٢٠

ئازا– زیرەك، هوشیار

ئەو مندالە لە وانەکانیدا ئازایە

ئازا– ساغ، ساخلەم، باش، چاك، نەشکاو، هیچ لێنەهاتوو

حەسەن وەك گوێزی ئازای لێ هاتووە

ئازا– جوانمەرد، یارمەتی دەر

ئازاد ئازایە بۆ یارمەتی دانی هەژاران

ئازاد–١– رزگاری، ئازادی ، ٢–بە خۆڕایی ، بەلاش، بەگەردن ئازایی دەت دەمێ

ئاژوتن– خێرا ڕۆیشتن، خێرا

"صبح حەیا ئێڤاری باژوین"

ئاسك– خێرا، تیژڕۆ، خۆشبەز

ئەسپەکەی شەماڵ– دەڵێی ئاسکە

حەمەد هێندە خێرایە دەڵێی ئاسکە

ئاسکە دل– ترسنۆك، بێ غیرەت

ئاسکە دلی– ترسنۆکی، بێ غیرەتی

کابرایەکی ئاسکە دلی بۆدەلەیە

ئەو تەقە تەقە چیە خۆ ئاسنگەری ناکەن

ئاسن– بەهێزو قەیم، گیانی ئاسنە

ئاسنگەری – تەقە تەقی زۆر، حاجەت بەیەکتری دادان و دەنگ لێ پەیداکردن

منداڵینە ئەوە چیە دەڵەی ئاسنگەری دەکەن

زوبیحی– ل٣١

ئاسن و پۆلا: مرۆڤی بە هێزو تواناو ماندوو بون نەزان

ئاسنین– بەهێز، بەقووەت، بەکێش، نەسلەمینەوە لە ماندوو بوون ناخۆشی‌دا

گەنجی ئاسنین زۆرن

ئاسۆ– مەیدان و بەرێنایی کارو چالاکی لە هەموو بابەتێك

ئاسۆی بیرکردنەوەی فراوانە

ئاسۆ– سنوری دوو چلۆنایەتی کۆمەلایەتی

ئازادی و بەختەوەری نەتەوەی کورد وا لە پشت ئاسۆی برایەتی کوردو عەرەب.

ئاسۆ پەڕاندن: لە ئەندازە دەرچوون: کاری ناڕەوا کردن

ئاسۆ ڕوون

ئامانجێك و كارێك كە چاك و باشی لێ وەدی بكرێت

ئاسۆ رەوشەن

ئاسۆ تاریك: ئامانجی كارو كردەوەیەك كە هیچ خاڵێكی باش و چاكی لێ وەدی نەكرێت

ئاشنا– پەیوەندی و مەیل

لەگەڵ خواردنی برنج ئاشنا نیم

ئاشی كرێوە– خێرا خێرا قسەكردن و نۆرەی كەس نەدان

ماشەڵا حەسەن دەڵەی ئاشی كرێوەیە هیچی بۆ منداڵەكان نەهێشتەوە

ئەوە چیە دەڵەی ئاشی كرێوەی، دەنۆرەی مەش بدە با دوو قسان بكەین

ئاشی ئاو لێ برای– بە ماڵێك ئەوترێ لەبەر هەژاری یا چۆڵی بێ دەنگ بێت

ئاشی كرێوە– زۆر بەپەلە خواردن

ئاش نانەوە– سازكردنی گێرەو كێشەو گرفتاری بۆ كەس

ئەم كابرایە ئاشێكی بۆ ناویتەوە هەرچی دەكەین ڕزگاریمان نایە

زەبیحی– ل٣٨

ئاغا: كەسێ چاوی لەوە بێت كە خزمەت بكرێت و كارنەكات

ئاغا دووگام دزرایە: سكاڵاو نیگبەتی كەسێ باس بكات و كەس وەڵامی نەداتەوە

ئاغا ژن: ژنی جل و بەرگ پاك و خاوێن و كارنەكەر لە ماڵی خۆیدا

ئاغایی: زۆرداریو كەڵەگایی كردن

ئاغای خۆم: كەسێ لە شوێن و جێگای خۆی سەربەست بێ كەسێ نەبێ ئەمری بەسەر بكات

ئاسۆ لەلا روون بوونەوە: چاك چاك دیتنی ئامانجی مەبەست و كارێك لەلای كەسێ

ئاڵۆز– حالەتی پیاوی تووڕە و تۆسن، توند میجاز، نەسازاوی تووش و تووڕە

ئاڵۆزكان– ئاڵۆزان– ئاڵۆزبوون– تووڕە بوون، رق هەستان، زویربوون

باوك‌و كوڕه كه‌ی له‌ كاره‌كه‌ی ئاڵۆزكان

ئاڵۆز كردن– شێواندن، شێوانن، تێكدان، بێ سه‌رو به‌ر كردن، ته‌گه‌ره‌و چه‌ت خستنه‌ پێش جێبه‌جێ كردنی كارێك‌و دژوار كردنی

كاره‌كه‌ی لێ ئاڵۆز كردین

ئاڵۆزی– تووڕه‌یی‌و تۆسنیٚ، تونده‌ میجازی، رق هه‌ستاو

ئاڵۆزی– پشێوی‌و شێواوی بار

ڕۆژه‌كی ئاڵۆزو ناخۆش بوو

ئاڵۆزو پڵوز– ئاژاوه‌و هه‌راو هوریا

ئاڵۆزو پلۆز– شێوانی چلۆنایه‌تی كۆمه‌ڵ، تاریكی

دنیایه‌كی ئاڵۆزو پلۆزه

ئاله‌ت: هۆ، وه‌سیله ، كه‌سێ بۆ مه‌به‌ستی تایبه‌ت كارت بۆ بكات

ئاله‌ت:– توتن:– سماق:– پیاوی تووره‌و تۆسن: مرۆڤی توند ته‌بیعات

ئاگا– زاناو فامیده‌، وه‌خه‌به‌ر

كابرایه‌كی به‌ئاگایه

ئاگالێبوون: یارمه‌تی دان

ئاگا لێ نه‌بوون: یارمه‌تی نه‌دان

كاكم ئاگای لێمان نییه: واته یارمه‌تیمان نادات

ئافره‌ت: به پیاوی ترسنۆك‌و بێ غیره‌ت ده‌ڵێن

ئاگر– به‌ڵا، چورتم، كێشه

به‌لام كێ ئاماده‌یه خۆی بخاته ئه‌م ئاگره‌وه

بله– ژان– ل ٨٩

ئاگر– گه‌رمای به‌تین

كه نیوه‌ڕۆ داهات دنیا ده‌بێته ئاگر

ئاگر– تا، گه‌رما (نه‌خۆشی)

هه‌موو گیانی ده‌ڵه‌ی ئاگره‌ دایسێ

ئاگر : بەڵاو نەگبەتی رۆژگار
لە ئاگر رزگار بوین بەسەرماردا کەوتین...
گەدا- ل ١١٤
ئاگر- ڕق‌و تووڕەیی، تووڕە بوون
جاری قسەی دەگەل ناکرێ ئاگری لێ دەبارێ
زەبیحی- ل٤٩
ئاگر- کەسی هاروهاج
ئاگر- شەڕو جەنگ، فیتنەو شەڕو شۆڕ
هیتلەر ئاگرێکی کردوە دنیای سووتاندو خۆشی سووتاند
زەبیحی- ل٤٩
ئاگر- ئازا لەشەڕدا
لەشەڕدا ئاگرە
ئاگر: زۆر ئازا لە کار
ئاگر- چەك‌و تەقەمەنی
هەموو گیانی خۆی کردۆتە ئاگر
ئاگری بێ ئامان: مرۆی بە زیان‌و بێ فەڕو کە لە هیچ شتێ سڵ نەکاتەوە
وەك ئاگری بێ ئامان بەربوە سەرو سامانی تەتاری...
شەرەف- ل٦٨٩
ئاگر پارە- بە مردومی فێڵبازو ئازاردەری خەڵك دیت
ئاگر پارە- زیرەك، بەکار، لێهاتوو، زرنگ گەورە یا بچوك
ئاگر پارە- بزێو، بزۆز، دڕ، شەڕانی، هارو هاج، ناڕەحەت
(منداڵ)
ئاگر پێ خۆش کردن- ئاگر پێ هەڵکردن: هاندانی کەسێ بۆ ئاژاوە نانەوە، کەسێ بەکار هێنان بۆ ئاژاوە نانەوە
ئاگری پێ کەوت- تووشی بەڵا بوو

ئاگری پێ کەوێت – تووشی بەڵای ڕۆژگار بێت
ئاگری پەنگر: کەسێك هارو هاج بێت
ئاگر پێ هەڵگرتن: کەسێ توشی بەڵا کردن‌و خۆڵێ پاراستن
ئاگرت لێ باری– تووك‌و نزایە لە یەکی دەکرێت لە کاتی تووڕە بوون ڕق هەستان واتە تووشی بەڵاو ناڕەحەتی بێت
ئاگری تێ بەربوو– فەوتان، لەناوچوون، تەفرو تونا بوون
کوڕە دانیشە هەی ئاگرت تێبەربێ، یاخوا ئاگر دەعومری‌و ماڵیان بەربێ
زەبیحی–ل٥٠
ئاگر تێ بەربوو– ناڕەحەت بوون لەبەر بەزەیی پێدا هاتنەوە بەماڵی یەکێکدا
ئاگر ئەکاتەوە– بۆ کەسانێ بەکار دەهێنرێ بە مانای زۆر تووڕە بوون، ڕق هەستان
ئاگر باران– گەرمای بێ ئەندازە، زۆر گەرم، ئێجگار گەرم، گەرمایەکی ئێجگار بەتین
ئەمڕۆ گەرمە دەڵێی ئاگر دەبارێ
ئاگر باران– دابارینی گولە لە شەڕدا، گولە باران، شەڕە تفەنگی زۆر، دەس ڕێژ کردنی چەند کەس وێکرا
ئاگر باران– ئاشووب‌و پشێوی ڕۆژگار، قەومانی ئاژاوەو کارەساتی گەورە، نائارامی، هەراو هوریا
ئاگر باران– بۆردومان
لە دوێنێوە ئاگر بارانی شارەکەمانی کردووە
ئاگر باران– بەڵا، نەگبەتی ، نیگەرانی، ناهەمواری، شەپرێویی، پەرێشانی
ئاگر باراندن– ئاگر باران کردن– گولله باران کردن، تۆپ باران کردن، بۆردمان کردن، هێرش بردنە سەر بە تەقەمەنی هەمە چەشنە
ئاگر بارانە– شەڕێکی گەرم، تین‌و تاوی شەڕ، گەرمەی شەڕ

ئاگر بڕ- قسە کردن بە جۆرێکی وا کە شتێکی خراپ لە خۆت دوور بخەیتەوە، دەست پێش کەری بۆ وەستاندنی تەشنەی خراپە، پێش ئەوەی بتگاتێ

ئاگر بڕ- ئاگر بەس- شەڕ بەس

وەستاندنی شەڕو ناکۆکی لە نێوان دوو دەوڵەت یا دوو کەس یا چەند کەسانێك کە پێکەوە بجەنگێن

ئاگر بڕ- نەهێشتنی تەشەنەی هەراو دەمە قاڵێی نێوان دوو یا چەند کەس

ئاگر بە جەرگ وە نان: (١) زەرەرو زیان بە کەسێ گەیاندن (٢) منالْ کوشتن

ئاگر بەردانە گیانی خۆ- ئاگر لە خۆبەردان: خۆ تووشی بەلاو چورتم کردن

ئاگر بەسەر خۆدا کردن- خۆ تووشی بەلا کردن

ئاگری بەسەری خۆی دا کرد- خۆی تووشی بەلای کرد

ئاگر بە عومر کەوتن: کەسێ تووشی بەلایەك بێتو لەناو بچێت

ئاگرو بارووت: دوو دوژمن تووشی یەك بن

ئاگر تێ چوون - بەغیلی بردنی کەسێك بە کەسێکی تر

"هەر باسی پیاوەتی حەسەنمان کرد، ئەو ئاگری تێچوو"

"یەکێك بە کۆكو پۆشتەیی ببینێ ئاگری تێدەچێ"

نەمانزانی بۆچی وا ئاگری تێ چوو

زەبیحی- ل٥١

ئاگر خۆش- قسە خۆشو گاڵتەچی، خۆش گوفتار، سوعبەتچی

ئاگر تێ بەربوون- زگ پێ سوتان

پیاو هەر نەیبینێ چاکە، ئاگری تێبەر دەبێ، ئاگرم بۆی تێبەر بوو

ز- ٥٠

ئاگر تێ بەربوون- ئاگر تێ کەوتن- توورە بوون، ڕق هەڵساندنو توورە کردنی کەسێك بە قسە یا بە کردەوە

(ئەوە چیت پێ ووتوە وا ئاگرت تێ بەرداوە)

ئاری - ل١٣٦

ئاگر تێ بەربوون- ئارەزوو هەڵسان، زەوق هەستان، زەوق جولان، مەیل جووڵان، بزاوتن، خوتك بوون

"ئەو كیژە ئاگری تێ بەربووەو، ئاگای لەخۆ نەمایە بۆ مێردی"

ئاگر تێ بەربوو- پەرێشان (بۆ یار یان دڵخواز

ئاگر تێ بەربوو- چوختی، لاسار ، چەقاوەسوو

ئاگر خۆش كردن- قسە هێنانو بردن لە نێوان دوو كەسا كە نێوانیان ناخۆش بێت، ناخۆشتركردنی نێوانی دوو كەس فیتنەیی كردن، شەڕ بەرپا كردنو دنەدانو بۆ هەراو كێشە

ئاگر خۆشكەر- كەسێك فیتنەیی دەكا، یەكێ دەبێتە هۆی نێوان ناخۆشیو بەشەڕ هاتنی خەڵك، دنەدەر بۆ شەڕو هەرا، مایە فیتنە

ئەوەندەی مست لە چاوان دەی شارێكی بەشەڕ دەدا.

پیاوی ئاگر خۆشكەر هەمیشە ڕوو زەردە

زەبیحی- ل٥١

ئاگر خۆشكەرە- (كەسێ- شتێ- یا كردەوەیەك) كە ببێتە مایەی بەرپابوونی شەڕو شۆڕو فیتنە لەناو خەڵكا، یا لە شوێنێك، فیتنەباز

ئاگر خۆشكەرەی ئەم دێیە، ئەم هەتیوەیە

زەبیحی- ل٥١

ئاگردان- بە قسەو فیشاڵ یەكێك لە مەیدان دەركردن، دەرپەڕاندنی كەسێ

كابرایان هەر بەجارێك ئاگرداو قسەی پێ نەكرا

ئاگر دامركێنەر: ئاگر كوژێنەوە: ئەو كەسەی دەبێتە هۆی نەهێشتنی ئاژاوەو دووبەرەكی

ئاگر كوژانەوە: ئاگر دامركانەوە: نەمانی شەڕو شۆڕو ئاژاوەی بەرپابوو

ئاگردان كوێر بوونەوە: كەسێ ژیانی لە پێناو خزمەت كردنی لێقەوماوان بردبێتە سەر دوای خۆی كەس نەبێ جێگای بگرێتەوە وەكو ئەو خزمەت بكات

ئاگردان كوێر نەبوونەوە: نەوەی چاك لە ڕێگای بابو باپیرانی لە بیر نەكات خزمەتی خەڵك بكات

ئاگر زمان- ئاژاوە بەرپاكەر، مایە فیتنە

ئاگر کوژاندنەوە: (١) ئاژاوە نەهێشتن (٢) دامرکاندنەوەی کاری جنسی
ئاگر کردنەوە- ئاگر نانەوە، شەڕو شۆڕ بەرپاکردن، هەراو زەنا دامەزراندن
هیتلەر ئاگرێکی کردەوە دنیای سووتاند
زەبیحی- ل٥٢
ئاگر کردنەوە- هەراو هاج کردنی منالان و داببن نەبوونیان
منداڵ! ئەو ئاگرە چیە کردۆتانەوە، ڕۆکەون بۆ خۆتان
زەبیحی- ل٥٢
ئاگر کەرەوە: ئەوەی شەڕو ئاژاوە دروست دەکات
(ئاگر کەوتنە گیان- ئاگر تێ بەربوون- ئاگر گرتن)- ئارام لێ هەڵگیران، کەوتنە تالووکەو جێگە بەخۆ نەگرتن
ئاگر کەوتنە ماڵ- ماڵ وێران بوون، ماڵ کاول بوون
ئاگر گرتن- تووڕە بوون و هەڵچوون، توند بوون ، ڕق هەستان و سوور بوونەوە
هەر گوتت ئەم ئیشە واناپێ ئاگری دەگرێ
زەبیحی- ل٥٢
ئاگر گرتوو- سووتاو: ئارام لەبەر بڕان لە ڕووی کاری جنسییەوە
ئاگر گرتوو- بزێو، لاسار، (منال)
ئاگر گرتوو- ڕق هەستاو، تووڕەبوو، قین گرتوو، شێتگیربوو
ئاگر لە زاری بارین: زۆر بێزار لەدەست کەسێ یا کردارێك
ئاگر لە ریشەی عومر بەربوون: نەمان و مردن بەهۆی بەڵایەکەوە
ئاگر لە دنیا بەردان: خەڵك بێزار کردن بە هۆی کاری ناڕەواوە
ئاگر لە دەروون: خەمبارو غەمگین بەهۆی کارەساتێکەوە کە تووشی مرۆۋ دەبێت
ئاگر لە چاو بارین- ئاگر لە نیوچەوان بارین- ئاگر لە دەم و چاو بارین، زۆر تورە بوون، رق هەستان، شێتگیربوون
ئاگر لە چاوان هەستان: زۆر ئازاردانی کەسێ

ئاگر لە کای کۆن بەرپابوون: کۆنە ئاشقێك یان خەفەتبارێك شتێك ببێتە هۆی وەبیر هاتنەوەی خەفەتەکەی

ئاگر لە ماڵی خۆ بەردان- ئاگر لە گیانی خۆ بەردان: کەسێ خۆی تووشی بەڵاو ئێش و ئازار بکات

ئاگر لە ووشکە دەغڵ‌ودان بەربوون: زۆر زوو تەشەنە کردنی شەڕو کێشە

ئاگر لە جەرگ بەردان- ئاگر لە هەناو بەردان: (١) منداڵ کوشتن -فەرزەندە کوشتن، ئارام لەبەر نەهێشتن

ئاگر لە جەرگ بەربوون- ئاگر لە دڵ بەربوون- ئاگر لە هەناو بەربوون: ئیجادی حالەتی بەزەیی پێداهاتن ویژدان جولان لە دڵی کەسێکدا

ئاگر لە جەرگ بەربوون: ئارام لەبەر بڕان

خورشید کە چاوی بە دلبەری شۆخ و بەدەو کەوت

ئاگری لە جەرگی بەربوو. دم دم- ل٤٣

ئاگر لە گیانی خۆ بەردان: کەسێ بە خۆی تووشی بەڵا بکات

ئاگر لێ بارین- تووشی بەڵاو دەرد هاتن، بەڵا بەسەر هاتن، تووشی چورتم بوون

ئاگرو ئاسن: سوتان و کوشتن

ئاگرو بەنزین- ئاگرو پوش- ئاگرو با- گڕو پوش- ئاگرو باروت- ئەستێ و پوش: حالی دوو کەس کە پێکەوە هەڵ نەکەن کۆبونەوەیان ببێتە مایەی ئاژاوە، ئازادو نەوزاد ئاگرو پوشن

ئاگرو دو- ماڵ و حاڵ، خاووخێزان

ئاگرناك- تووڕەو تڕۆ، دەهریی، لاسار

(ئاگری ژێر کا- ئاگری بن کا- ئاوری بن کا)- سەرە سۆدەرە ، مایە فیتنە، ئاژاوەچی، بنەمای شەڕو کێشە ، کەسێك لە سەرەوە خۆی پیاو چاك نیشان بدات لە ژێرەوەش نێوانی خەڵك تێك بداو یا خراپە بکا.

کەسێك شەڕو هەرا سازکاو ئاژاوە بنێتەوە

(لاچۆ لەبەر چاومان مەمێنە هەی ئاگری بن کا)

چۆن ئەم کابرایە لەو خەڵکە بۆتە ئاگری بن کا)

زەبیحی- ل٤٨

ئاگری جگەر: ئەو ئێش و ئازارەی منداڵ کە توشی باوك یان دایك دەبێت کاتێك منداڵەکەی توشی بەڵایەك دەبێت

باوکە پیرەکەش ئاگری جگەر هەڵی ئەگری ئەچێ بۆ سەرا کوڕی بدۆزێتەوە

ئاگری دزان: بە ئاگرێکی کزو بێ تین دەڵێن

ئاگری بێ ئامان: (١) بەڵایەکی گەورەی بێ چارە، (٢) مرۆڤی بەدفەڕ

ئاگری ڕك: زۆر تورە بوون (ئاگری ڕکی کوژایەوە)

ئاگری سەر گیانی دوژمن: کەسێ ئارامی لە دوژمنی خۆی هەڵگرتبێ و هەراسانی کردبێ

ئاگری قودرەت- ئاگری سروشتی- بەڵای لابەلا، قەزاو قەدەر

ئاگری قودرەت- بزێو، بزۆز، نەسرەوت

ئاگری قودرەت: ئاشووبگێڕ، شەڕانی، شەڕفرۆش

ئاگرەکی گەورەیە: بە شەڕەکی گەورە دەڵێن کە زۆر شوێن بگرێتەوە

ئاگر هەڵکردن- ئاگر هەلایساندن- ئاگر داگیرساندن: ئاژاوە دروست کردن، ئاژاوە نانەوە

ئاگرۆك- ئاشووب گێڕ، کەسێ ئاژاوە بنێتەوە

ئاگرین- ئاگراویی- بەجۆش بۆ ئافرەت

ئاڵتون- بۆ شتی بەنرخ دەڵێن

ئالقە لە گوێی- ئالقە بە گوێ- ئالقە بە گۆش- بەندە، غولام، عەبد، کۆیلە، بەنی، کەنیز، خزمەتکاری رام

ئالقە لە گویی- خۆفرۆش بە بێگانە

ئەگەر "سورتك"ی بچوکتان بە خوبزەیەکی ئەلقە لە گۆی خۆتان وەربگرن

بۆرە - ل ٣٥

ئاو- ڕەونەق، وورشەو بریسکەی هەندێ شت

تیغی ئاودار

ئاو- بۆ هاسان بوونی کارێك دەگوترێت
ئیشکە وەکو ئاوێ دەڕوات
ئاو- بۆ هیچ نەبوون دەگوترێت
بازاڕ ئاوی تێ وەرکرایە
ئاو- نەگبەتیو بەڵاو تەنگاو بوون دەگوترێت
ئاوی گەیشتە چۆکان
(ئاواز- قەوان- زورنا): دەنگو باسی هەڵبەستراو
هەر ئەو ئاوازە مابوو، هەر ئەو قەوانە مابوو، هەر ئەو زوڕنایە مابوو
ئاوا کردن- خۆشیو شایی خستنە ماڵ
بەخێر بێی سەر چاوان ماڵەکەت ئاواکرد
ئاوبوون- تەریق بوونەوە، خەجاڵەت بوونەوە، شەرم لە خۆ کردن
ئاوبردە- ئەو شتەی بە فیڕۆ دەچێو خەساردەبێ
ئاو بە ئاگردا کردن- کوژانەوەی فیتنەو شەڕو شۆڕ
خوایە ئاوەکی بەو ئاگرەی داکەی
ئاو بەدڵدا کردن: ئاسوودە کردن
ئاوپا هاتن- هەست کردن بە ماندوو بوونی زۆر
ئاوی پام هات- زۆر ماندوو بووم
ئاو چاو سەنن- ترساندن، زراو بردن، تۆقاندن
ئاو خواردنەوە- کاری هاسانو بێ ئەرك
جا ئەوە چیە؟ هەر ئاو خواردنەوەیە لەلای
پیاو کوشتنو ئاو خواردنەوەی لەلای وەکوو یەکە
چ پیاو بکوژنو چ ئاو بخۆنەوە
زەبیحی- ل٨٣
ئاوی پێ چوون: زۆر ماندوو بوون
ئاوی چاو داهاتن: زۆر تەماشا کردنو روانین

ئاوی کوڵیو: کەسێ کە تورە دەبێ

خەڵك وەك ئاوی کوڵیو هاتۆتە جۆش...

زەبۆك– ل١١٤

ئاوی ڕژاو: کارێك کە لە دەست چوبێ

ئاوی لە دەوی وەرکرایە: زۆر برسیە

ئاوی تێ وەرکرایە: نەبوون– دەست نەکەوتن

بازاڕ ئاوی تێ وەرکرایە

ئاو خۆرەوە– ئەو کەسەیە کە لە دێدا فەلاحەتی نەبێ

چەند کەسی ئاو خۆرەوە لە دیوەخانی دانیشتبوون

ئاودان– پەروەردە کردنی کەسێ لە کارێك

باش مێشکی ئاو دایە

ئاوداهاتن– ئاودادان (کوێر بوون)

ئاوی چاوم داهات

ئاوەدان– زۆرزان

ئاوەدانە– زۆرزانە

ئازاد لە دڵی خۆی ئاوەدانە

ئاو کردنە بێژینگ: ڕەنجی بێ هودە دان

ئاوی خوڕ: مرۆی بە گاڵە گاڵ و بە قسەو خۆهەڵکێش

ئاوی مەنگ: مرۆی لەسەر خۆ دەبنەوە بڕ

ئاوری سوور– بەڵای گەورە

ئاوری سوور بێ خۆی تێ داوێ

ئاوڕ لەسەر خۆ نەدانەوە: ئاور لەخۆنەدانەوە: ئاگا لە خۆ نەمان و لەخۆ نەپرسینەوە لەکات و ساتی تەنگانەدا

ئاور دامرکاندن: ئاژاوە نەهێشتن

ئاوری سەرپێچی دامرکاند

ئاوڕژاندن- ئیشێك یا ڕێو شوێنێك کردن بەباو، دابو دەستور داخستن، داهێنانی بیدعەتێك

ئاوێکی وای نەڕژاندوە خۆشەوە بێ.

ئاوێکی خراپیان ڕژاندوە

بێفایدەیە مەنعی من ئێستاکە لە گران

بۆ عاشقی بێچارە زوو ئەم ئاوە ڕژاوە

نالی

زەبیحی- ل٨٦

ئاوڕ لێ دانەوە- لاواندنەوەو چاکە دەگەڵ کردن، یارمەتی دان

ئاوڕێکمان لێ بدەنەوە

ئاوڕ لێ نەدانەوە: لە کاتی تەنگانەو ناخۆشی یەکێ بتناسێو یارمەتیت نەدات

ئاوڕ لەکەس نەدانەوە: کەسێ کە کاری لە دەست بێتو یارمەتی کەس نەدات

ئاوڕ نەدانەوە- منەت نەزانین، منەت هەڵ نەگرتن

ئاوریش بوون- کتوپڕ پەلاماری کەسێك دان، بە جۆرێ کە ڕیشیان تێك بئاڵێ

هەر لە دوورەوە ئاورێشم بو (بوو بە هاوریشم

ئاوڕی بە خێری بەرکەوت: یەکێك یارمەتی درا لەلایەن کەسێ بەتواناوە

ئاوری دڵ- ئاگری دڵ: کەسەرو خەمو خەفەت

ئاورینگ- تورەیی و گوڕە گوڕی کەسێ رقی هەستابێ

ئاورینگ دان- تورە بوون و پرتەو بۆڵەو هەڕەشەو گوڕەشەکردن

ئاورینگ هێنان- زۆر تورە بوون لە کەسی، پشك هێنان

سەرکان هەر ئاورینگی دەینا

ئاوزەنگی داگرتن- سوربوون لەسەر قسەی خۆ- ئیسرار کردن

ئاوزەنگی داگرت تا پارەکەی لێ نەستاند وازی نەهێنا

ئاوزەنگی کوت- خێرایی، بەپەلە

ئاوزەنگی کوت خۆیان گەیاندە سەنگەرەکان

ئاوزەنگی لێدان– خێرا ڕۆیشتن

ئاوە سو– بێ شەرم و لاسار

ئاوس– تووڕە، شێتگیر

وەختە ئاوس بێ لە داخی ئەو هەتیوە

ئاوس بوون– تووڕە بوون و ڕق هەلستان لە کەسی

ئاوس بوون– بەغیلی بردن

ئاوسکردن– تووڕە کردن

بە قسەکانی ئاوسی کرد

ئاوقا– تووش بوون

ئاوقای– تووش بوو

ئاوقای نسکۆیان بووم

ئاوی پێ داهاتن

ئاوی قاچ داهاتن– زۆر ماندوو بوون

ئاو کردنە بێژینگ– ئاو کردنە سەبەتە: کاری بێ هودە کردن

ئاوگل– ئەو شوێنەی پیاوی لێ دەمرێ ئاوگل نالّی بردۆتە ئەستەمبول

ئاوی ڕژاو: کاری لەدەست چوو

ئاو لە سەروچاوەوە پیسە: کارەکە لە سەرەتاوە ناپوخت و نابەجێ و ناڕەوایە

ئاوی لە کونێ کرا: بە یەکێ دەگوترێ کە تەنگاو کرابێو فشاری خرایتە سەر

ئاونا– ئەرێ و نەری: پاڕایی، واس واس

ئەو ئاو نایەت لە چیە، زوو ئیشەکەمان بۆ بکە

ئاوێنەی بالانما: کردارێك یان نوسینێك یا قسەیەك ببێتە هۆی نیشاندان و ئاشکرا کردنی ڕووداوێك یان کارێکی نەزانراو

بەراستی جامەکە ئاوێنەیەکی بالانمایە بۆ کارەساتەکە

ئاشی ئاو لێ برای: شوێنی کپ و بێ دەنگ دەڵێن

ئاوڕنەدانەوە: منەت نەزان

........ ئاورپیان وە سوڵتان نەداوەو تەنانەت جوێنیشیان پێدا
شەرەف– ل ٦٩٠
ئاو لێ نەخواردنەوە– درێغی نەکردن و کار ئەنجام دان
ئاو لە دەو وەرکران– زۆر برسی
ئاوی لە دەوی وەرکرایە– زۆر برسیە
ئاه– ماوەو مەودایەکی زۆر کەم
هەر ئاهێکی مابوو بخنکێ
ئاهێکی مابوو بکەوێتە خوارەوە
ئاه– هەناسە سارد
ماڵیاوا کۆنە هاودەردم/ بە دوور بێ لە ئاهی سەردم
ئاه تێدا نەمان– ئاه لەبەر بڕان– ئاه دەبەردا نەمان: بێ هێز بوون
هەژار– بۆرینە
ئاهن دل– ئاسن دڵ– بە پیاوی ئازاو دڵ رەق دەڵێن
ئاهوپا– ئاسك پا– خێرا، چالاك
ئاهو پێ– ئاسك پێ– خێرا، چالاك
ئاین– زۆر خۆشەویست
خەلك ئەڵێن کفر مەکە بەم تەرحە مەدحی یاری خۆت
گۆگرانی خۆشەویست من یارەکەم ئاینمە
(کامیل)
ئەبلە خەرج– هەڵە خەرج– پارە بەفیڕۆ دان، کەسێك پولی خۆی بەبێ‌جێ خەرج دەکا
ئەوەندەی ئەبلە خەرج کرد تاوا ڕووت ڕەجال بوو
ئەبلە رەنج– حاڵی کەسێکی لەبەر تێ نەگەیشتوویی زەحمەتی بە خۆڕایی دەروات، رەنج بە خەسار
ئەحمەدو مەحمود کردن– لەم لاو لاو بە دەردی سەری بژێوی خۆ پەیدا کردن

(..... تا مێردەکە شەم نەگێرا بوو، هەر باشتر بوو، ئەحمەدو مەحمودەکی بۆ ئەکردین .......) ژان

زەبیحی- ل١٢٤

ئەرز بەخۆوە نەگرتن- ئارام لەبەر بڕان لەکاتی تووڕەبوون

ئەرزی مقدەس- شوێنێك یەکێك بۆ لێدانیشتن‌و هاتووچۆ هەڵی بژارد بێ‌و زۆر دڵ پێوەیی

ئەوە بۆچی دوکانی مامە حەمەت لێ کردووین بە ئەرزی مقدەس

( هەموو دنیای لێ بۆتە ئەرزی مقدەس

هەردەو قوژبنە دەخزی)

زەبیحی- ل١٣٠

ئەرك- زەحمەت ، تەکلیف، زەحمەت‌و چەوسانەوە

هێندەم ئەرك داوە نەبێتەوە

بۆرینە- ل٢١

"..... هیچ ئەرکێکم لەسەر تۆ نیە بۆچی دەرم دەکەی"

(گەدا- ٩٤- ز - ١٣١)

ئەرك کێشان - زەحمەت کێشان

ئەرکی کێشابوو- ئەرکی دابوو- زەحمەتی بینی بوو

ئەرك بەسەرەوە بوون- زەحمەت کێشانی زۆر بۆ خەڵك

ئەرێ‌و نەرێ- پاڕایی، حولحولی

ئەزمان ڕەش- زمان بەد- زمان خراپ، شۆخار

ئەزمان ڕەش- بێ شەرم‌و جنێودەر

ئەژدیها- ئینسانی زۆرخۆر، تێرنەخۆر

ئەو ئەژدیهایە بەمن تێر ناکرێت

ئەژدیها- ئافرەتی دڕو بێ شەرم، ئافرەتی بێ حەیاو دڕ

ئەژدیها- پیاوی زۆر ئازا، گەڕناس، بوێر، عگید

ئەو ئەژدیهایە کێ دەرەقەتی دێ
ئەژنۆ پێ دادان- ڕام کردن
ئوردوی سوور لە ستالینگراد ئەژنۆی بە هیتلەر دادا
ئەژنۆ دادان- مەغلووب بوون، بەزین
(ئەژنۆ شکان- چۆك شکان- قەدەم شکان- قەدەم مردن)- بێ هێز بوون، بێچارە بوون
"... ڕێزە چاوی بە گزیرو مزیر کەوت لەترسا ئەژنۆی شکاو زمانی گیرا..."
بۆرە- ٦٣
" ئەی ئەژنۆ شکاوخۆ..." بێچارەخۆ
ئەی بە ئەژنۆی شکاو بێیتەوە
ئەژنۆ شکاو- تاساو، بێ هێز بوو
ئەژنۆ لەرزین- ترسان
ئەفلاتون: زیرەکی هاروهاج
ئەستۆ خوار- ئەستۆ کەچ- عاجزو پەرێشان، ماتو مەلول، لێقەوماو، ناتەواو
نۆکەرو تابیعەی کوڕی من پاکی ئەستۆ خوارە
تحفە: جـ٢- ٢٢١
ز- ١٤٤
ئەستۆ کەچە راوەستاوە
حەزرەتی عیسا بۆی پاراوە
تحفە جـ٢- ٢٤٢- ز- ١٤٤
ئەستۆی خۆیانی گرتەوە- بەسەر خۆیاندا سەپا
ئەستۆ شکان- مردن، لە ناوچوون
دەك بە ئەستۆی شکاو بێیتەوە
ئەستۆ شکاندن- زیان گەیاندن بەخۆ، یا خەڵك، وەسەر تەڵە پەڕاندن

ئەوە حەمەیەو دۆغری، ساڵی بە هەزار چووبێ ئەستۆی خۆی دەشکێنێ، وا دەکەی ئەستۆمان بشکێنی

هەستن با بڕۆین تا لە خشتەی نەبردووین‌و ئەستۆی نەشکاندوین

ز- ١٤٤

ئەستور- زۆر ، گەورە، قوە، مشە

حەمە قەدۆی موسڵێ دەوڵەمەندێکی ئەستوور بوو

لە پێنجوێن بەفرێکی ئەستوور باریوە

"... ڕووی کردە کۆڵانی سێهەم، لەوێ تەماشای کرد دوکەڵێکی ئەستوور بە هەوادا دەچێ"

قزلجی: پێکەنین- ١٨ – ز- ١٤٥

ئەستوور – بەهێز

ئەستوران- قسەی پڕو پوچ، قسەی زیادە کردن، قسەی‌و کاری ناڕێك‌و ناپوخت‌و بێ ڕێ‌و جێ

ئەم کابرایە ملی لێناوە ئەستووران دەڕێسێ خۆشی نازانێ دەڵێ چی

زەبیحی- ل١٤٥

ئەستوور بوون- قەڵەو بوونی ئادامیزاد

تەماشای: دەتگوت شەمی شایی باییە ، چۆن ئەستوور بوە

ئەستۆ وورد بوون- مل شکان- تووشی بەلا بوون‌و تێچوون

ئەستۆی وورد بوو- تووشی بەلا بوو

ئەستێرە- بەهرە، چارەنووس، هات، بەش

ئەستێرەی سەیر سەیر کەوتنە گەشانەوە

ئەستێرە کوژانەوە: توشی نیگبەتی بوون لەناوچوون

ئەستێرەی کەوتە کزی- تووشی نەگبەتی بوو

ئەستێرەی سیوەیل: کەسێ کەم خۆی دەرخات

ئەستێرەی گەشە- سەرکەوتووە لە ژیاندا

".... ڕۆژ بەڕۆژ ئەستێرەی بەختی گەشتر هەڵدەهات- هەتاوی لێ هەڵات..."

هەژار – شەرەف نامە- ل٤٩

ئەفلەتون: مرۆی زیرەك و قالبوی ڕۆژگار

ئەگریجە بڕین- شورەیی بەسەر هێنان، بە پەند کردن (ئافرەت)

ئەگریجەت بە بڕین چێ- تووشی شوورەیی بیت، ریسوا بکریت

ئەگەر- لەمپەر، تەگەرە

ئەگەری- لەمپەری، تەگەرەی

کارەکەمان ئەگەری تێ مەخە

ئەگەر تێخستن-

(١) گومان خستنە سەر قسەو باسێك

(٢) بەرهەڵست هێنانە سەر ڕێگای جێبەجێ بوونی کارێك

توخوا ئەگەر ئەگەری تێبخەی

هیچ ئەگەری تێ مەخە لە بەیانی زووتر نیە بچۆ

ئەوە چیتە هەرچی پێت دەڵێن ئەگەرێکی تێ دەخەی

ئەلماس- زۆر تیژ

سینگت ئەلماسی دوو سەر

یەك یەك لە جگەرم هەڵچوو

فۆلکلۆر

ئەم دیو ئەو دیو کردن- وورد بوونەوە لە شتێ، زۆر بە دیقەت سەیر کردنی شتێ

ئەمانەت- گیان ، روح

خوا هەر وەختێ حەز بکات ئەمانەتی خۆی دەباتەوە

ئەمڕۆ- ئەوڕۆ: کات و ساتی ئێستا

ئەمڕۆ بازاڕ ئەوهایە

ئەموست بەستە- فریودراو، هەڵخەڵەتاو

ئەموستیلەی دەست: کەسێ کردنە هۆ بۆ ئەنجامدانی کارێك
"... خەڵکی ئەم ناوەی کردبوو بە ئەموستیلەی دەستی..."
ل٦٧
ئەموستە چاو- ئەمگوست لەچاو- تاریکایی خەست، زۆر تاریك
"...نەدەچووە تیلەکۆ بەشەوی ئەنگوستە چاو سینگی خۆی بە گوللەوە نێت و تاووس بۆ من بدزێ"
گەدا- ل٥٤
ئەنگوتك ژمێر- نان بژێر- هەنگوتك بژێر- خەسیس، رژد، قرچۆك
ئەنگوستیلە: هۆ، وسیلە
ئاسۆ ئەنگوستیلە لە پەنجەم
ئەنی خۆش- خۆش گوفتار ، بە حورمەت رێز
پیاوێکی ئەنی خۆشە
ئەنی گرژ- دژ، مچ و مۆڕ
ئەورۆ نا سبەی- تەفرەدان
ئەو باب مرد- واتا لەمەولا وەکو جاران هەموو کارێکت بۆ مەیسەر نابێ
ئۆردو- کۆمەڵێکی زۆری خەڵك کە پێکەوە جۆرە پەیوەندێکیان هەبێ
ئۆردو بازاڕ- شوێنی بە ئاژاوەو هەرچی و پەرچی کە کەس ئاگای لەکەس نەبێ
ئێخسیر- هەژارو جێگەی بەزەیی
ئێخە گیر- زۆردار، شەڕ فرۆش
ئێخە گیر بوون- بەرەنگار بوون، شەڕ فرۆشتن
ئێسك- روخسار ، شێوە، شکل و شێوەی مرۆڤ
ئێسك شکان- نێوان تێك چوون و کوژرانی چەند کەس لە نێوان دا
ئێسك قورس- ئێسك گران- رەزا قورس: بەدسکوت، کرێت، بەنوك
ئێسك قورسە- بەدسکوتە

ئێسك سووك– ڕەزا سووك، خۆشەویست لەناو کۆمەڵ

"…. کالی کوڕێکی جوانی ئێسك سووکی بووە

ناومان ناوە هیوا…"

ژان– ل٢٤٧

ئێسك ڕەش بوون– خەم خواردنو توانای دەربڕین نەبوون

ئێسك شکێن، مەرایی کەر

ئێسك فیل– کاڵایەك لە دوکاندا زۆر بمێنێتەوە نەفرۆشرێ

ئیش– ڕووداو، بەڵا

ئیش لە مێران روو دەدات

ئیش لەدەست هاتن– کارامەو لێزان

ئیش لە دەست نەهاتن– نەزان، ڕەمەکی

ئیشك بوون– لە جووڵە کەوتن– تاسان

لە شەرمان لە جێی خۆ ئیشك بووم

ئینگلیز– مرۆڤی زیرەکی پشو درێژی کارزان

ئیشك کردن– بە مرۆی دمۆرو نیگبەت دەڵێن کە کار ئەنجام نەدا

بچێتە سەر زێی ووشکی دەکا

ئیشك هەڵاتن– ڕەق و تەق و باریك بوونی گیاندار

ئیی باغێ نیە: جێگای باوەڕ نیە– کارێك ئومێدت پێ نەبێ

ئێش– خەم ، پەژارە

زۆر بە ئێشە دەردی دووری، جەرگی پارە کردووم

(ئیمڕۆ بە سبەی پێ کردن– ئیمڕۆو سبەی پێ کردن– ئەوڕۆ سبەی پێ کردن– دەستی دەستی پێ کردن:– تەفرەدانی کەسێ ، بەقسە ڕاگرتنی کەسێ و بەکردار هیچ بۆ نەکردن

ئێوارە وەخت– درەنگ وەخت

ئێوارە وەختە، جرپن بەبەختە

ئێوارە بازاڕ– بازاڕی کەسادو بێ برەو
ئەوە ئەم بازاڕە بۆ وای لێهاتووە هەر دەڵەی ئێوارە بازاڕە

## ب - -١-

با– فیز، دەعیە، غروور

بای ڕەگوییان نیشتوە– غرور بوە

با– هیچ

ئەگەر چی قەننەکەی تۆ کارەبایە

بەڵام تەرکی بکە، ئەم کارەبایە

زەبیحی ل٩ ب٢

با– بێ فایدە

با هەر قسەی بکا وە بزانە بای دێ

زەبیحی ل ٩ ب٢

با– هەڵسانی زگ

زگم بای کردووە

بۆرینە–

(بابانت خراپ بێ– بابانت شێوێ– بابانت کوێر بێتەوە– بابانت بە قوڕ گیرێ) — تووکەو نزایەو تەنیا لە ناو ژناندا باوە، گەلێ جار هەر وەکوو قسەیەکی ئاسایی دەگوترێو لە دڵان گران نیە بەڵام لە کاتی دەمە قاڵیو شەڕە دندوکیدا بە (جنێو) حساب دەکرێ شەڕەکە بەتین تر دەکات.

زەبیحی– ب٢

هاتم لە لای هەریرێ — کوڵمی گوڵی سەر بیرێ

دە کچێ بێنە ماچت کەم — بابانت بە قوڕێ گیرێ

فۆلکلۆر

باب ئاوڕی وەسەر کوری نەدایەوە: ڕۆژانی پڕ لە ناخۆشی کەس نەتوانێ یارمەتی کەس بدات

باب و برا: زۆر خۆشەویست

بابردە– بابردوو– بە فیڕۆ چوو

دوای کلاوی بابردوو کەوتووە
بابردە- بابردوو- تەواو روت و نەدار، لات
بابردەڵە- ئینسانی بێ تاقەت و کزەڵووکە
منیش بابردەڵەی بەر گێژەڵۆکەم
دەمێك لەو قووڵکە، تاوێك لەو چڵووکەم
هێمن- زەبیحی- ل١٠ ب٢
بابۆلە- تێکەوە پێچان و زاڵ بوون بەسەریدا
کوڕە لەسەر پەت و سینگی خۆت دانیشە، دەنا هەڵستم دەت کەمە بابۆڵە
زەبیحی- ل١٠ ب٢
بابە- گەورەش بۆ رووی قسە دەکەسێ کردن بەکاری دێنێ
بابە گیان ئەو قسانەی تۆ ئاسمان و رێسمانێش نێن
بابە گۆش مانەوە: رەنج بەخەسار لە کردەوەو کارێك
بابدەست- مەردوومی نابووتی بێ پارەو پوول
بابدەستی- نابووتی- نەداری، هەژاری
باپیرم- گەورە بەرامبەر بە بچوك بەکاری دێنێ
باپیرم گچکەل ئەو ترێیە بە چەندە؟
باج ئەستاندن- هەر پارەیەکی بە زۆر دو ناهەق یەکێکی بەهێز لە بێ هێزێك بستێنێ، خاوە، ئەوی بە خورتی دەیسێنن
باجەو لێت دەستێنم چت لە دەست دێ لێی رامەوەستە
زەبیحی- ل١٤ ب٢
باج لێ گرتن- هەڵگرتنی شتێك لە شتێك بەناخوونەك
تۆ هەرچی ببینیت باجی لێ ئەگریت
بادار- مەردوومی بە فیز، بە دەعیە
بادانەوە- پەشیمان بوونەوە
هیوا بە بادانەوە فێرە

بادانەوە سەر- واز هێنان لە شتی، لە کاری یا لە کەسیو دیسان گەڕانەوە سەر ئی دوێنێ

حەمەم دیت دیسان بایدایەوە سەر کەبابچێتی

زەبیحی- ل١٧- ب٢

بار- ئەرکو رەنج، ئەرکو قورسایی مەعنەوی کارێك، ئەرك

ئەو بارە بەمن هەڵناگیرێ

ئەمان چەند بارت گرانە

باری قورسە

زەبیحی- ل١٨- ب٢

بار: زۆر

بارەك سەلام لە دایکت بکە.

بار- خەم، پەژارە

باری لێوو چاو دەم دەم ژەم ژەم دەخۆم

ئەو کوڕە گەلێك لێو بەبارە

بار- راستیو دروستی- پیاوێکی بێ بارە

بار- ئەزیەتو رەنج

لەش بەبار خۆم

بار - بەختو هات

بابایەکی بار کەوتوم بۆم نایە

بۆرینە- ل٣٩

باراش لێکردن- تێ هەڵکردنو درێژدان بە قسە

شازاد باراشی لێ کردووە

خال - ل٩٤

باربردن- هەڵکردنو لێ قەبوڵکردن

بەخوا برا من باری تۆ نابەم

بارچەوت- پیاوی ناڕاست، بێ ئاكار ، حاڵی كەسێكی قسەی كەسی بەگوێ دانەچێ ، كەسێكی كردەوەی پێچەوانەی باو نەرێتی كۆمەڵ بێ.

بارچەوتی- ئەنجامی كارو كردەوەی ئینسانی بارچەوت

بار ڕاست كردنەوە- كۆمەگ و دەفریا كەوتن

"زۆر لێ قەوماو بوم كاكم باری ڕاست كردمەوە"

بۆرینە- ل٢٠

یارمەتی دانی كەسێك تووشی گیروگرفت و ناڕەحەتی بووبێ بە تایبەتی لەلایەن پارەو پوولەوە

ئازاد حاڵی شڕبوو شێركۆ فریای كەوت و باری راست كردەوە

زەبیحی- ل٢٢- ب٢

بار سووك- كەم ئەرك، حاڵی ئینسانی بێ ئەرك، حاڵی كەسێكی كە چووە شوێنی خەڵكی ئەم جێیە زۆر بە خۆیەوە ماندوو نەكا

زەبیحی- ل٢٢- ب٢

بار سووك- پیاوی فەقیرو نەدار، هەژارو نەدار، نەدارو بێ سامان

" كەركوڵ و بار سووك"

بار سووككردن- زەحمەت و دەرد لەسەر خەڵك كەم كردن، كار لە كۆڵ كەسێ كردنەوە، تەكلیف لەسەر لابردن، ئەرك كەم كردن

ئەگەر ئەم دەفتەرەیان تۆ بینووسیتەوە بارم سووك دەكەی. خۆزگە دەڕۆیشتن و باریان سووك دەكردین

زەبیحی- ل٢٢- ب٢- بۆرینە- ل٢٠

بار سووكی- بوونی مەردووم بەسووكبارو كەم ئەرك، بێ ئەركی، بێ تەكلیفی. بێ زەحمەتی. ئاسودەیی و كەم ئەركی

ئەگەر ئیمڕۆ ئیشەكانت تەواو كەی بار سووكییە بۆ بەیانی، چابوو ئەمەش بارسووكییەكە بۆ شاسوار

ز-٢٢- بۆرینە- ٢٠- خال- ٩٦

بارکردن- زیاد له توانستی خۆی کار به کەسی ئەسپاردن بۆ جێبەجێ کردنی
"باری کردووم بەخۆم نەزانیوە"
بارکەفتن- بارکەوتن- تووشی نزوولی هاتن، بەخت کەوتن، بۆ نەهاتن، نەهامەتی، تووشی نارەحەتی (ماددیو مەعنەوی)و بەلا بوونو له ئەنجاما لەناو کۆمەڵدا بێ قەدر بوون ، بەدبەختیو نەهاتی،
ز- ٢٢- بۆرینە- ٤٠- خال- ٩٦
ئیمڕۆ بابایەکی بارکەوتووم کەس بەهانامەوە نایی
بارکەوتە- بارکەوتوو- بۆنەهاتوو- خراپ لێ قەوماو، بەیەکی دەلێن که بەدبەختیو نەهاتیی رووی تێ کردبێ، بەدبەخت
بارکێش- بەیەکێ دەڵێن که ئەرکی قورسی کەوتبێتە سەر
بار کێشان- هەڵگرتنی ئەرکی قورس، زەحمەت کێشان، ئەرکی خەڵك وەئەستۆ گرتن
بارگران- ئادەمیزادی تەمبەڵو تەوەزەل
بارگران- ژنی زگ پڕ
ژنی خالم باری گرانە
بارگران- میوانی چاو نەزیر یان هەواڵی خوێن تاڵ
بارگرانی- بارگرانایی- ئەرکی ماندوویی زۆر، کاری ئەركو تەکلیفی زۆر خستنە سەر کەسێ
" ئەو ژنەش بار گرانیيە بەسەر منەوە"
ئەگەر بۆتان نابێتە بارگرانی ئەم جانتایەم بۆ دەگەل خۆت ببە بۆ فەرامەرز
ز- ٢٢- بۆرینە- ٤٠
بارگێن- جنێوە بە مانای: بێ عەقلو حەیوان، یەخمەو بێکارەو ئەگەر بە تورەیی نەگوترێ له دلان زۆر گران نابێت
ئەم کابرایە هەر دەڵەی بارگینە
کورە بڕۆ هەی بارگین

باره لەمل: کەسێ یا کاری دەبێتە هۆی زەحمەتو ناخۆشی بەسەر کەسێکەوە

بارلار- لێقەوماو، کلۆڵ

ئەمڕۆ من بارم لارە

بارنەبردن- بەکەڵکی کار نەهاتنی ئینسانێك، هەڵنەکردن، گوزەران نەکردن وەگەل یەکێ هەرچی دەکەم باری نابەم

بارنەبەر- بارنەوەر- یاخیو لاسارو نەگونجاو، قیر سیچم، حالی کەسێکی تەمبەڵو بێکارەیی

بارنەبەری-بارنەوەری- بارنەبردن- یاخی گەریەتی

بارە باڕ- قیژە قیژو هەرای زۆری ئادەمیزاد

بە بارە باڕ کابرایان برد

بارەنج- ناهومێد لەکاری خۆی

بارهەڵگر- رەنجدەرو زەحمەت کێش، کەسێکی نارەحەتی زەحمەتی بۆ قبوڵ بکرێ

من باری تۆ هەڵ ناگرم

## ب — ٢

بارهەڵگرتن– توانابوونی کەسێك بۆ جێبەجێ کردن‌و ڕاپەڕاندنی فەرمانێك‌و کارێك

ئەم بارە قورسە چۆن بەو منداڵە بەستەزمانە هەڵدەگری

بارێك ڕێسی– دانەواندن‌و مەرایی کردن

بارێکان دەڕێسێ– قسەکانی زۆر درێژ دەکاتەوە، هەر لێی نابڕێتەوە

بارێکە– خۆشاردنەوە، خۆدزینەوە، فیزمالیك، ماتەمات

بارێکەی دایە بۆی دەرچوو

باری لێو– غەمگین، خەمبار

غەمگین‌و دڵ پەشێوم

بڕوانە باری لێوم

فۆلکلۆر

بارین– بۆ هات، بەخت هێنان

بەسەریدا باری

باروت– پیاوی توند میجاز کە زوو تووڕە دەبێ و هەڵدەچێ

قسەی لەگەڵ ناکرێ دەڵێی باروتە

باز– بە مرۆی ئازا دەڵێن

بڕۆن بۆ پێشەوە بازەکانی گەرمیان

بازار– سەوداو معامەلە – کاری کڕین‌و فرۆشتن، سەودا کردن، نرخ پرسین

ئیمڕۆ بازاڕ نیە

خولا بازارت بدات

زەبیحی– ل٣٢

بازاڕ تیژی– گەرم بازاڕی– سەودای زۆر لە بازاڕدا

بازاڕ خوەش– زۆر فرۆش، سەودا خۆش

بازاڕ کەساد– بازاڕ کەساس– کەم فرۆش، بێ برەوی کاڵا

بازاڕ گەرم–سەوداو مامەڵەی زۆر لە بازاڕدا بکرێ
بازاڕی مردوو– نەبوونی سەوداو مامەڵەی شتومەك وەك نەبوون وابێ
ئەمڕۆ بازاڕ بەیەکجاری مردووە
بازاڕی– کەم نرخ و سووك
گوڵ ئەمڕۆ خۆی مقابیل کرد بە ڕوخسارت لەلای خەڵقی
بەبێ هەردەم دڕاوو هەرزەگون مەحبوبی بازاڕی
"حریق"
بورینە– ٤٢
بازاڕی – ئادەمیزادی سووك و هەرزە بەتایبەتی ئافرەت ، ئادەمیزادی هیچ و پووچی بێ مایە
بازاڕی– جەلەبی، شتومەکێك کە تایبەتی و چاك نەبێ
ئەم دەرگایە بۆیە هەرزانە چونکە بازاڕیە
بازوو هەڵکردن– سازو ئامادە بوون
بازووم لێ هەڵکردوو، کارەکەم تەواو کرد
بازەڵە خوێندن– بێ شەرمی و بوێری، شەرم شکاو
نەوزاد بازەڵەی خوێندووە
بازنی زێڕلە دەستم: کەسێ کارو پیشەی بەسوود بزانێ
باژێر کردن– سەودا کردن– مامەڵە کردن
باسك هەڵماڵین– باسك هەڵکردن– سازو ئامادەبوون بۆ ڕاپەڕاندنی کارێك
دڵشاد باسکی لێ هەڵماڵیوە کارەکەی تەواو کرد
باسمیل– مەردومی بەفیزی خۆپەرست، بە فیزو خۆرانە
باسمیلی– خودپەرستی– فیزو دەعیە
باسەر– بەفیز، بەدەعیە، خۆپەرست
باسەری– فیزداری، باغیری
باش– زۆر، گەلێك

دوێنێ چووینە باخی ئاشی ترێی باشمان خوارد
خەڵکی باش هاتبوونە سەر قەبران
زەبیحی- ل٤٠
باش نەبوو- زۆر نەبوو، گەلێك نا، کەم
باغەڵ- باوەش
وەرە باغەڵی بابی خۆت
بچۆ لە باغەڵی دایکتدا بنوو
زەبیحی- ل٤٢
باکردن- تووڕە بوون
باڵا- درێژ
دەستێکی باڵای لە کیمیادا هەیە
باڵا بەرز- ئادەمیزادی شوش‌و باریك‌و بەژن ڕێك‌و پێك
ئەو باڵا بەرزە ئەو نەونەمامە
من بۆ کێ دەگریم کێ بەتەمامە
فولکلۆر
باڵا دەست- باڵا دەس- کەسێك کە بەهێزو بە تواناتر بێت لە یەکی تر
یاخوا هەر باڵا دەس بی
باڵا دەستی- باڵا دەسی- بەهێزی، بەتوانایی
باڵا کردن- گەشە کردن، گەورە بوونی مەعنەوی
گەز گەز باڵا ئەکەم- واتە لە خۆشیانا گەشە ئەکەم
زۆرم پێ خۆش بوو تەشریفتان هێنا، باوەڕ بکەن گەز گەز باڵام کرد
خاڵ- ١٠٣- زەبیحی- ل٤٩- ب٢
باڵ- باخەل بە ڕاکشاوی
دەڵێن پیاوی دەباڵ دابووە
باڵ بەسەر کێشان- چەوساندنەوە، داگیر کردن

دوژمن باڵی ڕەشی بەسەر کوردستاندا کێشابوو
باڵ بەسەر کێشان– یارمەتی دان، کۆمەك کردن
وەکو جوامێران باڵی بەسەر ئەو هەتیوانەدا کێشاو نەیهێشت پەرتەوازەبن
"زەبیحی– ل٤٩–ب٢"
باڵدرێژ– بەپشی، ئارام
مەلا ئاوات کابرایەکی باڵدرێژە
باڵدرێژ– بە توانا– بەیشی
باڵدرێژی– پشی درێژی
ئەو کارە پیاوی باڵدرێژی دەوێت
باڵ شکان– تووشی بەد بەختی بوون، بێچارە بوون، سەرنەکەوتن
ئەو زۆردارە ئەو هەردوو باڵی شکاو بێ چارە بووە
باڵ شکاندن– بێچارەو بێ هێز کردنی کەسێك
باڵ شکاو– بێچارە، تێشکاو، سەرنەکەوتوو
باڵگرتن– یارمەتی دان، هاریکاری
باڵ گرتن– خێرا ڕۆیین، زوو بزر بوون
کابرا چ زوو دەرپەڕی دەڵێی باڵی گرت
باڵۆرە–١– قسەی بەقەوکە کەس تێی نەگا
٢– قسەو باسی ناڕەوا
هەر ئەو باڵۆرە مابوو
باڵۆڵ – زانا ، تێگەیشتوو
باڵوڵ – گێلوکە
باڵوڵ دەگریا دەیگوت منیش بە تاوانی برام سزا دەدرێم
بنئاو– بەدزیەوە کار ئەنجامدان
بنباڵ– داڵدەدان و یارمەتی دان
خۆمان لەبن باڵی ناوە

بان سەر- ئامادەیی دەربڕین و نیشاندان بۆ ئەنجام دانی کارێك
ئاسۆ کارەکەم بۆ جێبەجێ بکە ! بان سەرم
بان هەردووچاوم - بێ گرێ و کێشە کار ئەنجام دان
بان هەردوو چاوم کارەکەت بۆ دەکەم
باوبژ- تووڕە بوون هەر بەقسە
هیچ ترست نەبێ لەو پیاوەی ! هەر باو بژە لە زگی دەردەکات
باوەش بۆ کردنەوە- دالدەدان و یارمەتی دان
باهاتن- گرنگی پێ نەدانی قسەی یەکێك کە قسەیەکت پێ بلێ یا ئامۆژگاریت بکات
بای دی لەکنە من قسەکانی جەنابت
بایبالدان- گەڕان لەدەشت و دەر بۆ حەسانەوە. هەوا گۆڕین، پیاسەیەکی بچووك لە شوێنێك هەوای پاکی هەبێت، ( دەرەوەی شار ناو باخ و بێستان)
ئێواران تۆزێ بای بالی خۆت بدە، چووینە شەقلاوە بای بالی خۆمان دا
هەژار - ٢٩- ز- ٦٥
بایە دەس- بەو کەسە دەلێن کە هەلە خەرجی دەکات
بایە دەس قەت دەولەمەند نیەوگ
(گەرمەسێر- علی سایە)
بایە قوشی لێ دەخوێنێ: بە شوێنێك وێرانەو کاول دەگوترێت کە کەسی تیا نەبێ
برا کوژی- هاو خوێنی خۆ کوشتن
بایە دەسی- هەلە خەرجی
بایە دەسی خاس نیەو گژوژیش خاس نیە
باوك- کەسێ دالدەی کەسێکی لێقەوماو بدات
باوکە- گەورە بۆ ڕووی قسە دەکەسێ کردن بەکار دێنێ
شاهۆ وەرە باوکەکەم بە قسەی برای خۆت بکە

باوکەڕۆ- لە دەربڕینی خەم و خەفەتدا بەکار دێت- گریان و لەخۆدان بۆ مردوو

یەکێ یەخەی دادەڕی باوکە ڕۆیەتی

(حاجی)

(باوکیان- بابیان- باوکی هەموویان- باوکی گشتیان): شتێك لە ناو شتان لە

هەموویان بەکەڵك ترو بەسوودتر بێ

باوەش کردنەوە- داڵدەدان

ئێمە باوەشمان بۆ کردەوە لەکاتی لێقەومانیدا

بەئاگا- زیرەك، لە خەبەر زانین

باوکت کابرایەکی بە ئاگایە

بەئاوادان- دەئاو هاویشتن

بە ئاودادان- بەفیڕۆدان، بە خۆڕایی دان

پارەکەی بە ئاوێ دادا

ڕەنجی سەد ساڵەی باوکی دا بەئاوا

بە ئێش- بە خەم و خەفەت

زۆر بە ئێشە دەردی دووری - جەرگی پارە کردووم

بەبا: بێ هودە، بێ سوود

بەبا چوون- زایە کردنی شتێك بە هاسانی، بە خۆڕایی چوونی شتی (ماددی

یا مەعنەوی)

بەبا چوو عومری شیرینم

بە بادان- زایە کردنی شتێ، بە هیچی شتێك لەدەستخۆ دەرکردن

شێرە ئەو هەموو پارەیەی هەبوو بەبای دا

بە بڕشت- بەبڕ- بەزاکون، کار لەدەست هاتوو، مەردومی بەتواناو فەرمانڕەوا

بەبن- کیژی کون نەکراو

بە بوك بردن- جنێوو قسەو کردنە هەرا لە یەکی

بە بوکت دەبم

بە پشت- خاوەن داژدارو پشتیوان

بە پشتی کێ ئەم هەتیوە دەخوڕێ

بەپێ- حالی ئەو کەسەی لەڕێ ڕووینا خێرابێ، خۆش دەڕوا، خۆش ڕۆ، بلەزلریڤە چوونی، شاتر، خۆشبەز

بە پێچ- لە دەروناندا وریاو فێڵباز، فێڵباز

ڕێوی بە پێچە

بە پێ خواسی بەناو کەوتن: هەموو قسەیەك کردن بەبێ لێکدانەوە

بە پێی فیلان- زۆرو زەبەند، ئێجگار زۆر

بە پیرەوە چوون- دەگەل کارێ یا مەسەلەیێی بە خۆشی رووبە ڕوو بوون و پەسند کردنی

خەلك هەنووکە بە پیر کتێبی کوردی‌یەوە دەچن

بە پەلەکت دا نەدات- تووشی بەڵایەکت نەکات

بەتاڵ- (١) ئادەمیزادێك ئاقلی بەشت نەشکێ و لە کاران نەزانێت

تەماشای قەڵافەتی مەکەن هەر زۆر بەتاڵە

(٢) بێ ناوەرۆك

ئەم مەقالەیە چەند دوورو درێژە کەچی بەتاڵە

(بە تەپکەوەبوون- بەفاقی‌وە بوون- بەداوی‌وە بوون- بە تۆڕی‌وە بوون- بەتەڵەوە بوون)- توشی بەڵاو چەرمەسەری بوون

(کابرام بە تەپکەی‌وەکرد)

بە تۆبز- بەزۆر

بە تۆبزی - بە زۆری، بە خورتی

بە تۆبزی مالەکەیان لێ سەندم

بە توێکڵ- وتەیەکە دوو مانای هەبێ، قسەی بە هێما، قسەی زیپك پلار

قسەی بە توێکڵمان پێ مەڵێ

بە تیرێك دوو نیشانە شكاندن– بە بەردێك دوو كێڵ پەڕاندن– بە بەردێك دوو كێشكە كوشتن: قسەیەك یا كارێك دوو ئامانج بێنێتە دی

بەجەرگ– ئازا، رەشید، عگید، زیخ، بەغیرەت، بوێر

كابرایەكی بە جەرگە لە پەنجا سواران ناگەڕێتەوە

بە جەرگی– ئازایەتی، رەشیدی، عگیدی، زیخی، بەغیرەتی، بوێری

ئەو كارانە زەلامی بەجەرگی دەوێ

بەجۆنەدان– بەفیز

بەچرۆیی هەڵوەرا– بە خونچەیی هەڵوەرا: گەنجێك خۆشی ژیان نەبینێ زوو بمرێ

بەچكەمار : زۆرداری بچوك

ئەو خزمەتان بەجۆنادا

بە چاوان– ئامادەیی نیشاندان بۆ ئەنجامدانی كارێك

ئازاد ئەو قەلەمەم بۆ بێنە ! بە چاوان

بەچاو بردن– ئیرەیی پێ بردنو زیان پێ گەیاندنی یەكێ

بەچاویان بردم– زیانیان پێ گەیانمو ئیرییەیان پێ بردم

بەچاو چوون– زیان لێدراو بەهۆی ئیرە پێ بردنەوە

بەچكە شێر: نەوەی ئازاو پاڵەوانان

دەست گەرمی ئەو بەچكە شێرانە كێچی خستە كەوڵی شای ئێرانەوە......

شەرەف ل١١١

بە چاو چووم– زیانم لێ كەوت

بەچاوێك– بەچاوەك– وەكو یەك بەبێ جیاوازی

بەخشندەیی و دلاوایی سوڵتان بێ وێنە بوو، ماڵی دنیاو خۆڵی دەم ڕێگای بە چاوێك سەیر كردوە

شەرەفنامە ١٦٤

بەچكە سەگ– بە منداڵی هارو هاج دەڵێن

بەچنگ- خێراو ئازا لە پەیداکردن، پیاوێ کە بۆ پەیدا کردنی بژێوی خۆی ماندوو بوون نەزانی،

زۆر بەچنگە بۆ خۆی

بە چنگە چڕکی- زۆر بە زەحمەت

بە چنگە چڕکی ئیشم دەست کەوت

بە چەپڵەی دەستان: دەرکردنی کەسێ بەسووکایەتی

بە چەپڵەی دەستان دەریان کرد

بەچەلاو بی: لە ڕووی سوکیەوە بەکەسێ دەڵێن کە شایانی کارێك نەبێ

بەچیکلدانە- پشو درێژ، بەپشی

بەحر - دەریا: (۱) مرۆی بە پشیو لەسەرخۆ

(۲) زۆر زانین لە کردەو کارێك

هەر یەکەیان لە ئەدەبی کوردی‌دا دەریایەك بوون

شەرەف- ل ۷

(۳) شوێنی زۆر گەورەو قەرەباڵغ

بەغدا بەحرە

بەخت- پەنا، داڵدە، یەکێك کە بیەوێ کەسێکی دی لە کارێك یا ڕووداوێك کومەگی پێ بکا یا بەڵایەکی لێ دوور بخا. پەنا دەباتە بەر بەختی ئەو کەسە

"دەغیلی بەختت بم"

"ئەز دێمە بەختێ تە"

بە خەون: کاری نەبوو

بەخەون دیتم

بە خوێن- قوربانی دان

بە خوێن شاریان ئازاد کرد

بەدەس- بەدەست- بەدەسەلات: بەتوانا، بەهێز

بەدەس- بەدەست: ئازا لە شەڕو شۆڕدا

بەدەست گرتن: چوونی زاوا بۆ لای بووكو جووت بوونی دەگەڵی وەكو ژنو میردان، دەگەل بووك نوستن بۆ یەكەم جار

سێ مانگە بووكیان بۆ گواستۆتەوە هێشتا بەدەستی نەگرتوە

بەدەست نوێژ: دوور لە خیانەتو گزیو فێڵ كاركردن

بەدەم- بەدەو- بەزاروزمان- بەدەموپل: قسەزان، قسەرەوان، كەسێك توانای قسەكردنی زۆر بێ

دایكی نەوزاد ژنێكی بە دەمو پلە

بە دەمار: بەغیرەت، ئازا

پاڵەوانی بەدەمارو پڵنگی مەیدانی جەنگو شێری پركینە

بەرباد كردن: دانە بەربا: بەفیڕۆ بردن

عومری خۆی بەرباد كرد

بەراز: (١) مەردوومی بەهێزی بە كێش، پیاوی زۆر هارو كۆڵ نەدەر. (٢) خۆڕاگر بەرامبەر تەنگو چەڵمەی رۆژگار

شاهۆ بەرازە لە رۆیشتن ناكەوێت

بەرز:- مرۆی بە حورمەت

بەرز فڕین: خلور، بەفیز

بەرد بەشەق بوون: هەوڵو تەقەلای زۆر

بەر بە گوداان:- قسەو كرداری ناڕێكو ناپوخت كردن

"بەرد لەسەر دانان- بەرد خستنە سەر- بەرد خستنە بان":- تەپس كردن، سوڕ پۆشین، نهێنی نەدركاندن

هەرچی بوشە با بەردێكی لەسەر دابنێین

بەرد لێدان: توانج لێدان، پلار تێگرتن

بەرد نەرم دیتن:- لێ رادیتن، پێ قبوڵ كردن

بەردی بناغە: زۆر گرنگ

بەسەردا بارین: كەوتنە خۆشیەوە، زۆر پارە پەیدا كردن

به لبادی سەربڕین: زۆر بێ ویژدان

به موو لانەدان: زۆر ڕاستو ئەمین

بەرد وەبەر پێ دان– بەرد هاویشتنه بەر پێیان: تەگەرە بۆ کەسێ دروست کردن

مەردم گەرەکه بەردم وه بەر پێ بدا

شەرەف– ل ١١٤

بەردی بن گۆم وون بوونی کەسێو هەواڵ نەزانینی

به ڕۆژی ڕوناك– بەنوێژی نیورانی:– زۆر به ئاشکرا، کاری نائاسایی کردن

بەعەنتەری: بەزۆری { به عەنتەری دەکا}

بەقەرز ترسان: کەسێ لەداهاتو بترسی که تۆڵەی لێ بکرێتەوه

به قوڕێ گرتن : بەیەکجاری وێران کردن

بازار به قوڕی گیرایه

بەسەر دۆست: به دیمەن باشو چاك خۆنیشاندان

به کرۆکه: تێکدەرو شەیتانی کەر

بەگۆپال: به زۆری ، به خورتی

کار ئێستا به گۆپاله

به گونم– به کیرم– بەگونم کورم: له ڕووی سوکیەوه یەکێ دەیلێ که تووشی زیان بوبێت وا خۆی نیشان دا باکی پێ نییه

به گواوی شوشتنەوه: زۆر خەراپ ناو بردنی کەسێ لەپاش مله

به مێردان : فریودانی کەسێ بەبێ ئەوەی ئەو کەسه ئاگاداری فریودانەکه بێ

بەن بادان– داو بادان: دەرقەت هاتن، دروست هاتن

بەلاّم محمدی لەو کەسانه نەبو که ئەم جۆره قەلەو قوتانه بەنی بابدەنو بەبه گلەرێکو دووان سیانو دەیانیش بگیری

شەرەف ل ١١٥

بەندیخانە: وولاتێك یان شوێنێك یان جێگایەك كەس ئازاد نەبێو كەس مافی ئەوەی نەبێ بڕیاری خۆی بدات

بەوەستایی: بە عاقلیو لێزانی

بەهار: كاتو ساتی خۆش

بەهار بوو فەسلی زستانم ئەگەر یارم لەگەڵ بوایە

هێمن- تاریكو روون- ل

بەهاری ژیان: هەرەتی لاوی

بەهەشت: شوێنی خۆشو دڵفرێن

بەی: بێ: بۆ رەنگ زەردی بەكار دێ

لە دووری تۆیە رەنگم بوو بە بەی

بە داویوە بوون- كەوتنە داوەوە: بە فێڵ تووش بوون

بەداویوە كردن: (١) خەم لە هەموو شت خواردن

(٢) تووشی بەڵاكردن

بەدلغاو: ئادەمیزادی لاسار

بەدڵ حەزم دەكرد منیش هاتبام

بەدڵ وازی لێ هێنا

بەدڵ- (١) دڵاوا- بەخشندە (٢) بەڕاست

بەڕاستی كاروخ كوڕێكی بە دڵە

بەدڵ- بەڕاست، لەتەهی دڵەوە

بەدڵبوون- پەسەند كردن، پەسند بوونی شتێ یا كەسێ لەلای یەكێ تر

ئەم كابرایەم زۆر بە دڵە

بەدڵ نەبوون- پەسند نەكرد

زۆریش بەدڵی نەبوو بەڵام هەرچوو

برا: بە نیشانەی خۆشەویستیو ڕێزلێنان

دەزانی كە حاڵمان چلۆن بوو برا لە پێشدا چ زوڵمێك لە كوردان كرا

براژن: ووشەیەکە لە کوردەواریدا دۆست‌و برادەری کەسێك ، خێزانی هاوڕێکەیانی پێ بانگ دەکەن

برا گەورە: مرۆی زانا تێگەیشتوو کە دەبێتە جێ پرس‌و ڕایان لە نێو هۆزو تیراندا

برا گەورەیی‌و دەم راستی ئاوایی بابە لبابەوە بۆ مابووە وە

غەوارە– ل

برا گەورەی: وشەی ریز لێنان بۆ دۆست‌و ناسیاوان باکاردێ

برایەتی: پێوەندی دۆستانەی نێوان دوو یا چەند کەس یا نێوان میللەتان‌و نەتەوەکان

برایەتی کوردو عەرەب زۆر کۆنە تەئریخ شاهیدە

بردنە سەر– گەیاندنە سەر: سەپاندن

ئاخیری قسەی خۆی بردە سەر

برژان: قال بوون لە کارێك یا بابەتێك: خاوەن تاقی کردنەوە

برژاو: زۆر شارەزاو لێزان بوونی کەسێك لە کارێکدا

برسی (١) هەژار (٢) رژد ، چروك

برسیی‌و تێر: هەژارو دەوڵەمەند

بڕۆتاشین: رسوا کردنی یەکێك

برین: خەم‌و خەفەت

برینم مەکولێنەوە

بریندار: خەفەتبار ، خەم بار، تووشی بەڵا هاتوو

بریندار کردن : (١) خەم‌و خەفەت بەکەسێ دان (٢) قسەی ناڕەوا بەکەسێ گوتن

برین تیمار کردن: چارەسەرکردنی کێشەو هەرای کەسێ بەڵاڵی دوور خستنەوەی

بەتەمای سۆرەو تۆرە بین برینمان تیمار ناکرێت...

بۆره ل ٨٢

بگرەو بەردە: هەراو ئاژاوەو ئاگا نەبوونی کەس لەکەس

بڵند ڕوانین– بەرز ڕوانین: بە فیزو لە خۆبایی

بن شڕ: کاری ناڕەواو نابەجێ

بن کلك خواردن: حەز لەکاری ناڕەوا کردن

برین کولانەوە: خەمو خەفەت وەبیر هاتنەوە

برین کولاندنەوە: خەمو خەفەت وەبیر هێنانەوە

برینی گەورە: کەسێ توشی بەڵاو چورتمێکی گەورە هاتبێو درەنگ لەیاد بکرێت

بزربوون: ڕێ لێ تێك چوون، ڕێگا هەڵەکردن

شەوێك لە چۆڵی (قورفە) دوو سێ سەعات بزر بووین ڕێگاکەمان نەدۆزیەوە

بزمار لێدان: فێڵ لە کەسێ کردن، فریودانو هەڵخەڵەتاندن

بزنو خەرمان کوتاندن: فەرمانی قورسو گران بخرێتە سەر یەکێ پێی نەکرێت

بزنە ڕێ: ڕێی باریكو تەسكو ناخۆش

بڵقی سەر ئاو: بێ بایەخو بێ گرنگی

بسم الله: سەرەتای دەست پێ کردنی کارێك

هەتا من وتم بسم الله ئەو ووتی ئەلحەمد لله

بلوێر بەزێن: مرۆی بزۆزو دانە سکناو، پیاوی چەقاوەسو

بن: نهێنی

لە بنەوە کار دەکا

بناغە دانان: دەست کردن بە دامەزراندنو بنیات نانی هەر کارێكو هەر شتێ

تۆ جارێ بناغەی کارەکەت دانەناوە قازانجەکەی بەش دەکەی

بن کلك ژان کردن: کەسێ کاری باشی کەسێکی تری پێ ناخۆش بێت

بنكۆڵكردن: كنه كردنو پيلان گێڕان دژی كەسێ یا هەیئەتێكی كۆمەڵایەتی بە شێوەیەكی ئەوتۆ تا بەخۆی دەزانێ پرژەی بڕابێ

بن گۆم كردن: كەسێ یا شتێ بە فێڵ بزركردن

بنا گوێ : بن گویی: زۆر نزیك

مردن لەبناگوێیانە

بناو: بە نهێنی كار ئەنجام دان

بناوەكی بۆ لێدا

بن بڕ: بە دزی كاری نامرۆڤانە ئەنجامدان

بن پیل– بن هەنگڵ– بن كلێشە– بن قولتخ: ناو بیرو هۆشو هاندان بۆ كاری نالەبار

شەیتان چویتە بن قولتخی

چوە بن كلێشەی شوجاع الدین وەو دڵی كرمی كرد...

بۆرە پیاو– هەتیوچە: سفڵە، پێ نەزان: كەسێ چاكەو پیاوەتی لەچاو نەمێنێ

بۆن خوێن لێهاتن: زۆر ترسناكو ناخۆش

قسەكانت بۆنی خوێنی لێدێ

بوك: زۆر جوان بۆ شت

بوكو خەسو: دوو ئافرەت كە بەیەكەوە نەگونجێن

بولبول: حاڵی مرۆڤەكی بێ گرێو گۆڵو رەوان قسە بكا

بۆگەن: حاڵی كەسێك یا ڕژێمێكی بیروباوەڕی كۆنە پەرستانەی هەبێ

بۆگەن: حاڵی یەكێكی كردەوەو ڕەوشتو خووی خراپ بێ

بۆن كردن : سەرەتای هەست كردن بە كارێكی نهێنی

بۆنەكردن: هەست نەكردن بە كارێكی نهێنی

ئاگاداربە بۆنەكەن

بۆن كردنی دەم: تێگەیشتن لە قسەو گفتو لفتی كەسێ لە بارەی مەبەستێكی شاراوەدا

بنی دنیایی: به شوێنی زۆر دوور دەڵێن

ماڵیان له بنی دنیاییه

بوخچەی دڵ کردنەوە: هەموو قسەیەك کردن‌و ئەوەی لەدڵا هەبێ

بێ باڤ: بەد ئاکارو مرۆی زیان بەخش

بێ بەرو پشت: مرۆی هەلپەرست‌و بێ وەفا

بێ تام کردن– لەتام چوونە دەروە: کەسێ کاری ناهەموار بکات‌و خەڵك بێزار بکات بە بەردەوامی

بێتوك: نەدارو هەژار

بێ جەرگ: ترسنۆك، نەوێر

بێ داك‌و باب– بێ دایك‌و باوك: کاری ناتەواو بێ بنچینە

بێ دەست– بێدەس– کەم دەست: (١) نەدارو هەژار (٢) بێ توانا لەکار راپەڕاندندا

سەلاح الدین کەسی بێ کەسان‌و فریا دەسی بێ دەسان بوو

شەرەف ل ١٣٩

بێدەم‌و پل– بێ دەوو– بێ زارو زمان: فەقیرۆکەو قسە نەزان

بێدەمار: بێ غیرەت

بێ زاخ– بێ جەوهەر– بێ دۆن– بێ زراو: پیاوی ترسنۆکی بێ غیرەت

بێگوێ– بێگوه : لاسار، نەژنەو: بێ عار

بیبەری تێکدایە: کەسێ لە هیچ شوێنێك ئۆقرە نەگرێ: حاجمانی نەمابێ

بیر بە دەرزی لێدان: کاری زۆر زەحمەت‌و ناخۆش ئەنجامدان لە ماوەیەکی دوورو درێژدا

بیر لێدان – چاڵ هەڵکەندن: هەوڵدان بۆ ئەوەی خەڵك تووشی بەڵا بکرێت: پیلان دانان

بیوری بێ کلك: ئامرازی بێ کەڵك

بێ سێ بەر: مرۆی کە سوودی بۆ کەس نەبێ: مرۆیەك تەنها خێری خۆی بوێت

بێ سێو دوو لێکردن: کار ئەنجامدان بەبێ لێك دانەوە

## ( پ )

پا- لەعودە، لە مل

ئەم کارە پای تۆ

پابونەوە- مەرگی بەدفەڕ

کەنگی ئەو زاڵمە پا دەبێتەوە

پا پیا ساویین- پۆشین‌و چاوقووچاندن لە شتێك، چاوپۆشی کردن‌و سەرپۆش لەسەر دانان

پا پێ هەڵکێشان: تەمبێ کردن

پاتاڵ- مەردمی بێ کارە

پاتە خۆر- پیاوی خۆفرۆشی خوێڕی‌و سەر سواڵکەر

پاداگرتن- پێ داگرتن- پێ چەقاندن- سوور بوون لەسەر مەبەست، عینادی

پام داگرت‌و گوتم نایدەم

پارچە- لاکێش‌و قاڵی

پارسو ستور- بەفین، غلور

پارسەنگ خستنە پاڵ- ناوو ناتۆرەو شتی سووك خستنە پاڵی یەکێك

پاروو دەڕۆون کەوتن- پارو کەوتنە ناو ڕۆن:- زۆر سوود وەرگرتن لە کارێکی چاوەڕوان نەکراو

پاروو گلێن:- فرە خۆر زۆر خۆر

پارووە نان: بژێوی ژیان

پارووە نان پەیدا کردن: بژێو پایدا کردن

جاری ئەو پارووە نانەت لەکوێ دەست ئەکەوێت

ژان ل١٦٣

پارووی چەور: کاری پڕ سوود، کاری زۆر بەخێر

پارووی دڕکاوی: کاری پڕ سوود زۆر ناخۆش‌و سەخت

پاریخۆر: بێگانە پەرست

پاره پەرست- پاره پیس- چروك، رژد، چكوس، رەزیل

حاجی میرزا كابرایەكی پاره پەرست بوو

پاش- قون- قینگ

پاشا: زۆر باش

وەك پاشایان دەژیم

پاشا- ژین خۆش و كەیف خۆش

پاشا گەردانی- پشێوی شوێنێك بە هۆی نەمانی گەورەو سەرۆكەوە، تێكەڵ و پێكەڵ و هەركەس هەركەس

"...... لەو پشێوی و پاشا گەردانیەدا عوسمانی بە دەرفەتیان زانی و لەدوو لاوە ڕژانە ئێرانەوە........"

شەرەف نامە- ل ٢٢٧

پاشەل دڕاو: لە شەڕا بەزیو هەڵاتو

پاشایەتی- كەیف سازی وتەیاری

بە پاشایەتی دەژی

پاشایانە- ژیانێكی باش و چاك

پاشایانە دەژیم

پاش خوان خۆر - بەرماوە خۆر- گزیر، خزمەت چی- پاشماوەخۆر

پاش دز- دایكە دزانە:- ئەو كەسەی ڕێ و شوێن بۆ دزان دادەنێت بۆ دزی كردن

پاشكەوتو- ناتێگەیشتو

ئازاد كابرایەكی پاش كەوتووە

پاشە بەرە- دوامین فەرزندە، منالی كۆتایی لە دایك دەبێ

ئاسۆ پاشە بەرەیە بۆیە خۆشەویستە

پاشەڵ پیس- قون پیس:- كەسێ رابروویەكی پڕ بە گێچەڵ و خراپەكاری هەبێ

لە گەل ئەو پاشەڵ پیسەی مەگری.

پاشماوە خۆر: گزیر، خزمەت چی (.... لە ترسی کارو زەحمەت کێشان بۆتە پاشماوەخۆری ئاغا

گەدا ل ١٣٤

پاك– باش، چاك، بێ عەیب

نەوزاد کورەکی پاکە.

پاك روو– بە مرۆی بێ نیازو باش دەڵێن

پاك رووە– بێ نیازەو باشە

پاك بوونەوە– مردنی پیاوی خەراپ

پیاوی خەراپ خوا زوو پاکی کاتەوە

پاکژ– چاك ، باش، پەسند، بێ عەیب

پاك داوێن– بێ غەوش، ئەمین

پاڵ – هاوکاری

دوو کەس بوون ئەویش هاتە پاڵیان

پاڵا دڕانە– پێڵاو دڕانە– مزی ماندوو بونی پا

پاڵاوتن– زۆر ترسان

شاهۆ لە ترسانا پاڵاوتوویەتی

پاڵ پێوە نان– بێزار بوون لە شتێ یا لە کەسێ لەکۆڵ خۆکردنەوە

جەڵەبم هەبوو پاڵم پێوەنا

پاڵ پشت– یارمەتی دەر، داژدار– هاریکار

"..... سەید عەولای بە رەنجبەری هێنابویە لای خۆیو ببوە پاڵپشتێکی تەواوی ..."

غەوارە – ل ٣١

پا ماچ کردن– پاڕانەوە ، ناورانەوە

پاڵ لێ دانەوە – پاڵدانەوە: بێ غەم بوون، ئاسوودە بوون

برۆ لێ پاڵ دەوە

پاڵە- ئەندازەیەك لە دانەوێڵە كە سەپانێك بیدورێتەوە لە رۆژێك

پاڵە قەراغ گۆڕدابون: لەسەر لێوی قەبر : نزیك بوونەوە لە مردن بۆ كەسی بە تەمەن گەورە

پان بوونەوە- راكشان

( هەتیو چیتە ؟ پان بویتەوە)

پان بە پان- پانەو پان: بەبێ رودەروایسی بە ئاشكرا قسەكردن، ووتنی قسەیەك بە ئاشكرا بێ مەرایی

پانەو پان پێم گوت

پانكردنەوە- مەرایی كردن

پان مەكەوە- مەرایی مەكە

پاوپل- توانایی لە كاریی

پای-عۆدە، مل

ئەم كارە پای تۆ

پایزە برا- دۆستێك كە درەنگ دەیبینی

پاووشك- پێ رەش- دمۆر، نیگبەت

پچوك- خزمەت كاری بەر فرمان

تادەمرم پچوكتانم

پچوك بوون- بەر فرمانی كردن

پچوكی - خزمەت كاری ، نۆكەری

كورەكەم پچوكی خۆتانە.

پڕ- تورەو بەرك

دڵم لێت پڕە

پڕ - خەمناك

دڵم پڕ بوو گریام

پڕ – زۆر زاناو دانا

مەلایەکی پڕە

پڕ بوون– توورە بوون و پیش خواردنەوەی یەکێك لە کەسێ

زۆری لێ پڕم

پڕ بە پێست– بۆ کارو کردەوەی زۆر تەواو دەڵێن

پڕ بەدڵ– بەڕاستی، لە تەهی دڵەوە

پڕ بەدڵ خۆشم دەوێ

پرچ بڕین– پرچ تاشین– شورەیی بەسەر هێنان

....." بابان کوێر، سەرت لە هەشێ نێن، پرچت بەبەڕین چێت ، یاری خۆت لۆ بەلاش و حەلاش لەخۆدکرد!؟"

غەوارە ل ١٦١

پرد: رزگار کەر، قوتارکەر

ئازاد بوەتە پرد بۆ ئێمە

(پرسە گورگانە– پرسە گورگانی– پرسە خەسوانێ– پرسە خەسوانە)– پرسکردنە بە یەکێك بۆ کارێك کە نەتەوێ بە قسەی بکەیت بەڵام هەر بۆ گلەیی دوا ڕۆژ بێت. پرس پێ کردنی رواڵەتی و بە قسە نەکردن.

"....ونبولێکان چاری ناچار بەو کوێخایەتیە گورگانەی کە لە پرسە گورگانەیەك زیاتر نەبوو ڕازی بوون و گەڕانەوە....."

شەرەف نامە ل ٥٨١

پسان– زۆر ترسان، هەترەش چوون

وای هاوار کرد منداڵەکەی پساند

پساندن: ١– زۆر ماندوو بوون

٢– زۆر ترساندن

پشت– یارمەتی دەرو هاریکار، دژدار لاگر

تۆ بە پشتی کێ ئەمە ئەکەیت؟

گوتم " کاکە کەی من شارەزای ئەنکەرام.... کاری وا پشتی دەوێ.
زەبووك ل ٤٣
پشت ئەستور – خاتر جەم بێ نیگەرانی، کەسێك کە پشتیوانی بەهێزی ببێو ئاسودە بێ
پشت ئەستورین بە جەماوەر
پشت بە پشت: نەوە دوای نەوە
...... ئەم بەیتانە سینگ بە سینگو پشت بە پشت پارێزراون....
دم دم– ل٤
پشت بە عاردی نەکەوتن– پشت بە زەوی نەکەوتن:

١) نەدۆڕاندن
٢) زەرەر نەکردن
٣) زەفەر پێ نەبردن

پشت بەخۆ بەستن– باوەڕ بەخۆ بوون
پشت پێ بەستن– خاتر جەم بوون لە یارمەتی کەسێك
پشت پێ سپاردن: باوەڕ پێ کردن، متمانە پێ کردن
پشتی پێ مەبەستە! جێی باوەڕی نیە
پشت پێوە هێشان– زەحمەت کێشانو ماندوو بوون ، رەنج کێشان
منداڵەکان ڕەنجیان تیانەدابوو، پشتیان پێیەوە نەیەشابوو.
گەدا– ل ١٠٥
پشت پێ شکان:– کارو فرمانێك ببێتە هۆی زەرەرو زیان پێگەیاندن
پشت تێ کردن– خۆ لێ نەبان کردن، بایەخ پێ نەدان
(پشتی دەکارەکەی کردوە)
پشتدار– خاوەن داژدارو لاگری بەهێزو بە دەسەڵات
پشدان– هەڵاتن لەبەر دوژمن، بەزین لەبەر دوژمن
پشت دانەوە– پشت لێ کردنەوە، پشت لێ دانەوە– ئارخەیانو بێ خەم بوون

برۆ پشتی خۆتی لێ بدەوە مەترسە
پشت ڕاست– ئاسودە، پەسند لەکارو کردەوەدا.
پشت ڕاستی– بڕوا پێ بوون.
پشت سارد بوونەوە– ناهومێد بوون لەکار
پشت شکان– بەڵای زۆر گەورە
براڕۆ پشتم شکا
پشت شکان– (١) زەرو زیان پێ کەوتن (٢) توشی بەڵا بوون
پشت گرتن: یارمەتی دانی کەسێ
پشت گویی خستن– وەدواخستن
کارەکەم پشت گوێ مەخە
پشت لێ سەندن:– پشت ستاندن:– بەسەردا زاڵ بوون
پشتمێر– هاریکار ، یاریدەر
پشتوپەنا– جێگەی بانگو هاواران، یارمەتی دەر
غەوس پشتو پەنات بێ
پشتەپا– پشتەپێ – شەق، تێهەڵدان
پشتەملە– پشتە ملێ– بێگار ، کاری بە زۆرداری بۆ زۆردار زۆر کردن لە یەکێك بۆ کارێك
بە پشتە ملە ئیشی پێ ئەکا
پشت هەلکردن– قەڵس بوون،زوویر بوون
پشتی دەست گەستن: پەشیمان بوونەوە
پشتیوان – دەستگیر: یاریدەر ، هاریکار
خوا پشتیوانتان بێت
پشتیوانی– دەستگیری: هاریکاری ، لاگێری، هاڤگەلی
پشتیوانی کردن– داژداری کردن، لاگیری کردن
پشك کردن – پشك هێنان: لەکاتی تورە بوونا قسەی ناڕەوا کردن

پشتی یەك گرتن– تەباو تفاق
كەس لەكەس تۆڵە نەستێنێ و ئاشت ببنەوەوەك دۆست پشتی یەكتر بگرین
پشتێن گەرم– چالاك، بەتوانا
پشو سوار– قەڵس، تورە
پشو سوار بوون– قەڵس بوون، تورە بوون
بە قسەی من پشووی سوار بوو
شەرەف ل٦٩٢
پشی پشی كردن– مەرایی كردن
".... هێندەی بەدەوردا هات پشی پشی بۆ كرد چاكەی دەربارە كرد...."
شەرەف ل ٢١٤
پشیلە – بێ ئەمەك، پێ نەزان
یارمەتی ئەو پشیلەیەی مەدە
پشیلە شۆر– شتنی ئەندام بە ناتەواوی، شوشتنی ناتەواو
ئیمڕۆ لە حەمام لەبەر ساردیی ئاوەكەی خۆی پشیلە شۆر كرد
پف كردن– درۆ كردن
پف دان– پێهەڵگوتنی بەدرۆ
پفدراو، پفدریاك– دنەدراو، هاندراو
پڵنگ– بە مرۆی ئازاو گەڕناس دەڵێن لە شەڕدا
پاڵەوانی بەدەمارو پڵنگی مەیدانی جەنگ و شێری پڕكێنە
پڵنگ ئاسا– وەكو پڵنگ
پڵنگی بریندار : ئازای لە ڕق راچوو
پنچ كردن: عەیب داپۆشین
پنچ مەكە لە بۆی
پۆرگی دڵ هەلدرین:– سكاڵا باسكردن، دەردی دڵ رشتن
پندریسكە: كەسێ وازت لێ نەهێنێ و تۆش خۆشت نەوێت

پۆ- گێچەڵ ، سووکایەتی بەسەر هێنان

ئەو پۆیە ئازاد بەسەری هێنام

پۆخڵەوات- کاری پیس و بێ کەڵك

کارەکەت پۆخڵەواتە

پۆخدەرکەوتن- نەنگ و شوورەیی دەرکەوتنی یەکێك

پۆشتکەندە- شتێك کە زۆر چاك لێی کۆڵدرابێتەوەو ئاشکرا بووبێ

پۆشتکەندە کردن- لێکۆڵینەوەی شتێك و دەرخستنی

پۆشتەکردنەوە- سازو بێ نیاز کردنی کەسێك

پوش دانە دەست- زەرەر پێگەیاندن

پوش بەسەر کردن- ئاشکرانەکردن

کارەکە لە کورتی بیبڕنەوە پۆش بەسەری کەن

پۆڵا - بەهێزو ورە بەرنەدان

ورەی پۆڵایینی ئێوە هاندەرمانە

پۆڵا خۆر- پیاو ئازاو گوێ نەدەر بەخەتەر، مەردومی ئازاو نەترس

پۆڵایین- بە پیاوی ئازاو زیرەك و ماندوو نەبوو دەڵێن

پولەکی- رژدو چروك

پول پەرست: پارە پەرست: ئەو کەسەی زۆر پارەی خۆش دەوێت

پەپوولە- بە مرۆی بێ زیان و ڕاست دەڵێن

باوکت پەپوولە بوو

پەتبڕ- یاخی، عاسی

پەتپساندن- یاخی بوون

پەتپەتی- ئازارو تەفرەدان

پەتپەتی پێکردن- تەفرەدان

پەتپەتێن- سوکایەتی بەسەر هێنان و ئازاردان

پەتك پسێن- مرۆی ئازای هارو هاج

لەو پەتك پسێنەی مەترسێ
پەرستن: زۆرْ خۆشویستن
بەسەرخۆشم مەزانە بەدینم دەیپەرستم
دەستم گێڕا بەرۆکی مەمکۆڵەی کەوتە دەستم
فۆلکلۆر
پەردە لەڕوو لادان– پەردە لەسەر لادان: نهێنی ئاشکرا کردن، پەردە لەسەر هەڵماڵین
پەتکردن– هێنان و ڕاکێشانی بە سوکایەتی
پەتکی دەکەم دەیهێنم
پەڕاندنەوە– لە بەڵا ڕزگار کردن
"پەڕاندتمەوە"
پەردە: نهێنی لە پشت پەردە قسان مەکە
پەردە – شەرم
بێ پەردە قسان دەکات
پەردە پۆش– رازدار، ئەمین بۆ سور نەدرکاندن
پەردە پۆش کردن: شاردنەوە، ئاشکرا نەکردن
پەردە دڕان– ڕیسوا بوون
کابرا پەردەی دڕایە
پەردە دڕان–شەرم شکان
پەڕۆ بەگو، کەچە پەڕۆ– بە یەکێ دەڵێن کە کەس بە قسەی نەکات
باوکت پەڕۆ بەگوە کەس بایەخی پێ نادات
پەرێز– رابردوو پاشماوەی کەسێك
پەرێز پاکژ: (١) پەرێزی پاك
(٢)هەمووی
پەرێز پاکژ گیران: واتە هەموو گیران

پەرێزی پاکە– رابردووی پاکە

پەرێزی پیسە – رابردوی پیسە

پەلار لێدان– قسەی بە توێکڵ کردن

پەلارە کۆرە– بێ نیشان لە ئامانج دان

پەزی بێ شوان– مەڕی بێ شوان: میللەتی بێ کەس و بێ ڕەهبەرو بێ پێشەوا

با چیدی سەرگەردان نەبن و وەك پەزی بێ شوان نەمێنن

پەستانەوە– لێدان و تێ هەڵدانی کەسێ

کابرایان هەندێك پەستاوە

پەری – بۆ کچی جوان و خوشیك دەڵێن

پەل– بزێو

پەل مەبە

پەل بزافتن: هەوڵ و تەقەلادان بۆ دەرباز بوون

ئەو ناوە هەر بەویەو کەس ناتوانێ پەل ببزێوێ و کەس زات ناکات بلێ لەل...

شەرەف ل ٢٦٩

پەلە– بزێوە

منداڵەکی پەلە

پەل– بەلاّو چورتم

".... بەسەر پەلی وادا کەوتن کە دەبوو خۆیان لێ بپارێزم...."

تاریك روون– ل ٤٣

پەلاّوی کردن– پیس کردن: کاری خراپ خستنە پاڵ کەسێکەوە

پەل بزافتن– تەشقەلە پێ کردن

پەل بزافتی نەکەی

پەلکە پیاز– زۆر سپی

رەنگی وەك پەلکە پیازی لێهات

پەل کوتان– هەوڵ و تەقەلا

بەپەل کەتان پێك نایە

پەل پۆ- تەقەلاو بزوتنەوە

لە پەل پۆ کەتم

پەلپتوکە- پیاوی زۆر بزۆزو بێ ئارام

پیاو- مەردو رەندو دلاوا

بەڕاستی ئاکۆ پیاوە بۆ هەژاران

پیاو- نۆکەرو خولام

عولا پیاوی هەمزاغەیە

پیا چزان- زیان وێ کەوتن

پیا چزاندن- زیان لێدان

پیاز پاکردن: مەرایی کردن

پیادان- شەق هەڵدان لە یەکێ

هەر کە دیتی دەستی کرد بە پیادانی

پیادات- دزینی شتیك

هەرچی بەر دەستی کەوێ پیائەدا

پیادە- بە مرۆی کەودەنی نەزان لە کارێکا دەڵێن

ئازاد لە خوێندنا پیادەیە

پیاو فرۆش- ئافرەتی زمان لوس بە فڕو فێڵ

پیا هێنان- خەڵاس کردن

دەستەکی بە ماڵەکەی پیا هێنا

پێچانەوە- لێ پرسینەوەو بەسەرکردنەوە

لەو کاری دەپێچمەوە

پێ بە وودم- کەسێ لەگەڵ هاتنی بۆ شوێنی خێروخۆشی بکەوێتە ئەو شوێنە

پێچ- فێڵ

به پێچ– به فێڵ

پێ خوار دانان– هەڵە کردن ، کاری ناڕەوا کردن

حەدی چۆیە جارێکی دی پێ خوار دادەنێت

پێدا چوون– لەسەر قسە ڕۆیشتن و زۆر گوتن

زۆر پێداچوو

پێداگر– ڕکە گر

پێداگرتن– پێ چەقاندن– سوور بوون لەسەر مەبەست

پێم داگرت و گوتم دێم

پێ لەپاش– پاشگەز

پێ هەڵخلیسکان: تووشی زەرەرو زیان بوون

پیرێژنی دۆ لێ ڕژای– لە ڕووی سوکیەوە بە یەکێ دەڵێن کە بۆ زەرەرو زیانێک خەمبار بێت

پێدرێژی– لە ئەندازە دەرچوون

پێ درێژی نەکەی

پێ ڕەش– دمۆر، نیگبەت

پێ ڕەش– شوم، بە دووم، دمۆر

پێ ستوری– زۆرداری، خورتی

پێ ڕاکێشان– رازی کردن، قەبول کردن

پێ لێنان– دنا پیا نان، گوتن

مەردانە پێ لەوە بنێت کە چۆن ئەم خۆپیشاندانەت ڕێکخست..."

ژان ل ١٤٣

پێ لە زەوی نەکەوتن– کەیف خۆش بە بوونی کارێک یا ئەنجام دانی کارێک

هەر کە گوتم وەرە، پێ لە زەوی نەکەوت

پێ هەڵگرتن– خێرا ڕۆیشتن

توزێک پێم هەڵگرت

پیره– منداڵی بە تەمەن بچووك بەڵام قسەی وەكو گەوران بكات

بە منداڵەكەی گوت، پیرە زۆر دەزانی ها

پیر كردن– زۆر خەم خواردن لە كارێك یا لە كەسێ بە بەردەوامی

پێزانین– چاكە لەبەر چاو بوون

پیس– زۆر باش نا

پیس وەستایە

پیس– پشێوو نائارامی و هێمنی

رۆژەكی پیسە

پیس– گەند، چەپەڵ، ئاوەگل، ئاكار خراپ، مرۆی زیان بەخش، مرۆڤی بەدكار

كابرایەكی پیسە

پیس – زۆر ناخۆش

شەڕەكی پیسە

پیس– توندو تیژی

زۆر پیس بەگژیا چوو

پیس بوون– شلو ژان و وەزع نائارامی

نەهێڵن وەزعەكە پیس بێ

پیس كردن– خەلك هەراسان كردن

پیاوەكانی ڕژێم پیسیان كردیە

پیسكە– پیسۆ– رەزیل، چروك، رژد

ماڵی زۆر لەچەرو پیسكە نەبا ئەو ساڵ رزقی بۆ نەگیرا

تاریك روون– ل ٣٣

پیسكەیی– رژدی، چروكی

پێش بین– مرۆی زۆر زاناو بەتوژینەوە

پێكان – دۆزینەوەی مەبەست لە نوسراوێكی گرانی نادیار

مەعنای شیعرەکەی نالیم پێکا

پێکورە- پیادەی لەشکر، نۆکەری ناو ماڵ

پێك وەڕین- شەڕە جنێو

پێ گران- تەمبەڵ

پێڵاو دڕانە- مزی ماندووبوونی کەسێك

پێلێخستن- چاو قوچاندن لە شتێك‌و لەسەر نەڕۆیینی

پێلێداگرتن- زۆرکردن لە کەسێك‌و میچ لەسەر گرتنی بۆ کارێك

پێلێڕاکێشان- ئاسوودە بوون لە کارێك

پێلێنان- راستی وتنی کارێك یا کردارێك

پێلەجەرگی خۆ نان- کەسێ فشار بخاتە سەر خۆی بۆ کردنی کارێك کە پێی خۆش نەبێ

پێنواندن- تۆڵە کردنەوە

پێنج‌و دوو ڕۆژ- ماوەیەکی کەم

ژیان پێنج‌و دوو رۆژێکە

پینە- عەیب، نەنگ

پینەیە بە دەرکی قونیەوە

پینە کردن- داپۆشینی هەڵەو عەیب، تەپس کردن

پینە نەکران- ئاشکرا بوون

تازە پینە ناکرێ

پینەی قۆلنجم- کاری یا کرداری حەزی لێ نەکەیت‌و رزگاریت لێ نەبێ

## "ت"

تا- هاوشان، ئاوكوف، ئاوقەران

ئاسۆ كوڕێكە تای نیه

تاریك- كات و ساتی ناخۆشو نەزانین

".... حوكوومەتی تاریكیو نەزانیو كۆنەپەرستی، سەدەكانی ناوەڕاست دامەزرێنن...."

حاجی ئاغا ل ٧

تاریك بوون- تووڕە بوون، هەڵچوون

بەرچاوم تاریك بوو

تاریكیه- ناخۆشیه

دونیا یەك پارچە تاریكه

تاریكایی- ناخۆشی

تاریكایی باڵی بەسەر خەڵك كێشایه

تازە برین- كەسێ بە تازەگی تووشی بەڵایەك بوه

تازە بە تازە- تەوەزەلێ كە درەنگ درەنگ وەخۆ كەوتوه

كابرا تازە بەتازە هاتگە ئێژێ چە بكەم

تازە كیسه- كەسێ ئێستا دەوڵەمەند بووبێ

تازە پێدا كەوتوو- نەدی بدی: لە نەداریەوە تازە دەوڵەمەند بوو، كەسێ لە پاش هەژاری دەوڵەمەند بووبێ

تاكە سوار تۆزی پێ ناكرێ- بە تەنیا كەسێ كاری گران ئەنجام نادرێ

تاقانه- بێ وێنەو هەڵكەوته

تاڵ- تووڕه

هەموو دەم نێو چەوانی تاڵە

تاڵ - ناخۆش و نائاسوده

لەو رۆژگارە وەیشومەو تاڵەدا کەس دە هاواری کەس نەدەهات

شەرەف– ل١٢

تالاو– جەخارو خەفەت، دەردو خەمی زۆر

ئەگەر نەخوێنیت تالاو ئەکەم بە دەمتا

تاڵبوون– توورە بوون

تاڵبوون– رەزا گران بوون

تاڵتر– ناخۆشتر

من لە ژیانمدا رۆژی ڕەش‌و تاڵم زۆر دیبوون، بەڵام رۆژی رەشترو تاڵترم لەو رۆژە نەدیوە کەچوومە مەدرسە

ل٦ هێمن– تاریك روون

تاڵەوەکەرەی خۆشەوە کەرە– کەسێك دەمێك کەیف خۆشت بکاو دەمێکیش دڵتەنگ

تاڵ داگەڕیان – ڕەش هەڵگەڕان لە توورەییدا

تالاو– مەینەت‌و ئازار

تا عیزالدین بەخۆی زانی کاری لەکار ترازابوو لەلای برای شیرنەوە تالاوی بەدەم دا کرابوو

شەرەف ل ٦٨٣

تال‌و تاریك– پڕ مەینەت‌و ناخۆش

تاڵ تفق– ناخۆشی‌و ئازاری رۆژگار

تاڵ‌و شیرین– ناخۆشی‌و خۆشی

هەر چیرۆکێکی تاڵ‌و شیرینی دڵداری‌و هەر شاییو شینێکی گەورە

دم دم– ل ٣

تاڵی– دەردو مەینەتی‌وکوڵو کەسەر

پێکەنینێکی پڕ تەوس‌و پڕ داخ، پڕ قین پڕتاڵی‌و ئازار

کەرە لووتی مەنجوچەر ل ١٥

تاڵی و سوێری- دەردو چەوسانەوەی زۆر

تاڵی و سوێری ژیانم زۆر چەشتوە

تام- حەد، ئەندازە

لەتام چووە دەر

تام- مەبەست

تامی زاری بکەم- مەبەستی بزانم

تامەزرۆ- زۆر بەتاسە، ئاواتەخواز

جەماوەر تامەزرۆی ئازادیە

تامی زار گۆڕان- کەسێ لەگەڵت قسەی خۆش بکاتو هەر لەو کاتە بگۆڕێت بابداتەوە

تامی دنیای نەکرد- کەسێ لە هەرەتی لاوی دا بمرێت

تامی زار کردن- گفتوگۆ کردن لەگەڵ کەسێ بۆ زانینی مەبەستو ئامانجی

تان دەرکەوتن- (١) زوو کۆن بوونی جلو پەلاس

(٢) عەیبو عار ئاشکرا بوون

تانو پۆ- بنەچەو رەگەز، بنەو بنەچەکە

تانو پۆیان ئەناسم

تانو پۆ ئاوریشم- نەجیم زادە، عەسل زادە

تاوانەوە- تولانەوە: تەریق بونەوەیەکی زۆر

بە قسەکان تاوامەوە

تا هاتن- لەلا ناخۆش

بەو ئیشەی تام هاتییتێ : واتە لەلام ناخۆشە

() بوون- توش بوونی شتی ناخۆش

تڕ- خۆ هەڵکێشانی بەدرۆ

تڕاندن، تڕبڕین- پرزە برینو تەمبێ کردن، زەبوون کردنو زیان گەیاندن بە یەکێك

زۆری خۆ هەڵکێشا بەڵام تراندیان

ترو تۆپ- فیزو دەعیە

هەی لە قسەت نەبیەوە، مادام ترو تۆپت ئەوەندە گەورەیە ئادووسێ شەقاوان بۆ لای من باوی

غەوارە ل ١٦٦

ترخێنە- لە ڕووی سووکیەوە بەیەکێ دەڵێن

تەڕە ماش‌و ترخێنە جنێو دەدەن

ترەستور- تڕ ئەستور- تڕ زل، تڕزل + تڕگەورە + تڕ تۆپ- پیاوی بە فیزو لەخۆبایی

تڕ زلی- فیزو بایی هەوا

ترش- گرژی دەموچاو

هەموو دەم دەم‌وچاوی ترشە

ترش‌و شیرین - ناخۆشی‌و خۆشی

ترشی- ناخۆشی

بەخۆشیی بێو بە ترشی بێ دەبێ کارەکەمان بۆ بکەی

ترش‌و تاڵ- پیاوی ڕوو گرژو ڕەزا گران

تڕکردن- هەڵەی نابەجێ کردن

تڕکەن- مرۆی خوێڕی‌و کارنەکەر

تڕ لەیلی- تڕکەن- مەردومی بێ نموودی هیچ‌و پووچ

تڕ لێدان- مەردومی خۆ هەڵکێش

تڕۆ- جینگز، تورە

کابرایەکی تڕۆیە

تڕۆ- دەرکراو بەسوکایەتی

تڕۆ کردن- دەرکردن بەسوکایەتی

ئازادیان تڕۆ کرد

ترۆ زڕ– فیزو دەعیەو لەخۆبایی بوون

ترەك– ترە: پیاوی خوێڕی

ترە تڕ– چەنەبازیو چەقە سرۆیی و بێمانا

ئەو ترە ترە چیە دەیکەی

ترە کەلەك– کارێك کە سەر نەگرێ ، کارێك کە باش بنجو بناوانی نەبەسترابێ و لەوانەبێ سەرنەگرێ

ئەو کارە بەو ترە کەڵەکەی سەرناگرێ

ترۆتۆپ– فیزو دەعیە

ترۆتۆپی گەورەیە

تریفە تێ کەوتن– زۆر تێنوبوون

"تڕی کەندالی– تڕی ناو رانکیٚ– تڕی بن گۆمی": (١) قسەی کە هیچ مانای نەبێت

(٢) کارێك لەبیر بکرێتو هیچ حسابی بۆ نەکەی

تسکەن– ترسنۆك

تسن– بێکارەو خوێڕی، مەردومی تەوەزەل

تسدانەوە– سەرنەکەوتنی یەکێك لە ئەنجامی کارێکاو واز لیٚ نەهێنانی

تف– نەفرەتو توڕەیی و وەرزی

تف لەو کارەی کردت

تفاندنە ناو دەم– دەرس دادانی یەکێك

منداڵەکانی نەریمان هەموو دایکیان تفاندیەتیە دەمیانەوە

تفانە دەم یەك– کەینو بەین کردن، دوو کەس یا زیاتر کە لە قسەیەکا هەموو وەك یەك بن

داراو دلێر ئەڵێی تفاندوویانەتە دەم یەك

تف لیٚ کردن– ریسوا کردن

منداڵەکە تفی لیٚ کرد

تفو- نەفرەت لێ کردن

تفو لە پیاوی خراپ

تۆ برینەوە- قەڵاچۆ کردن

بەربابی ئاسۆ تۆیان براوە

تۆپ- درۆی گەورە

تۆپ ئاگردان- نابووت بوونی یەکێك

تۆپچی- (١)مەردومی نەزان ، (٢) درۆی زل

تۆپین- لە ڕووی سوکیەوە بەیەکێ دەڵێن کە زۆر بنوێ

تۆپ هاویشتن- سەرنەکەوتن لە کردەو کارێکدا

تۆڕ- گرتنی یەکێ بە فێڵ و گزی

بە تۆڕیەوە بوو

تۆڕە- فریودانی یەکێ بۆ ئەوەی بگیرێ

ئاگاداربە تۆڕە بۆت نراوەتەوە

تۆز کردن- ئاژاوەنانەوە

نەوزاد لەهەر شوێنێك بێت تۆز ئەکا

تەپڵ- ئاگادار کردنەوە

تەپڵی سەرکەوتن لێدان- ئاگادار کردنەوەی جەماوەر لە سەرکەوتن

تەپڵی پاشای لێدەدا- ژیان و گوزەرانی خۆش ڕابواردن

تولانەوە- تەریق بوونەوە، شەرم کردن

بە قسەی نارێك دەتولێمەوە

تووڵبڕ- خۆ گێل کردن و خۆ دزینەوە

ئازادو نەوزاد قسەیان دەکرد من خۆم لێ کردن بە تووڵبڕ

توولەك- تازە لاوی بێ موو

تەپەترە- منالی تازە پێ گرتوو کە زوو زوو بکەوێ، ساوای تازە پێ گرتوو کە دەکەوێ و هەڵدەستێتەوە

تەپڵە هرس– بەشتی ناشیرین‌و ناقۆڵا دەڵێن

تەخت بوون– تێك روخانی تەواو

ماڵەکەی ئاسۆ تەخت بوو

تەخت بوون– نەمانی گرێو قۆرت‌و بەرهەڵست لەکارێکا

تەخت کردن– وێران کردنی تەواو

گوندەکەمان تەخت کرا

تەخت وەرگەڕان– نەمانی پلەو پایەی زۆردارێك‌و لەناوچوونی

یاخوا تەختت وەرگەڕێ

تەڕ– جوان، پڕئاو

ژنێکی تەڕە

تەڕاش کردنە ئاش– دەوەن بەئاش: شەڕە قسەیەکی بێ هودەو بێ کەڵك، کێشەو هەرای بێ فایدە

دەوەن بەئاشمان پێ مەکە

تەڕ بوون– تەمێ بوون‌و پەند وەرگرتن، عارنان‌و پەند وەرگرتن

ئاسۆ هەرگیز تەڕ نابێ، هێندە بێ بارە بە هیچ شتێ تەڕ نابێ

تەڕبونەوە– (١) ئەو کەسانەی بە پیری ژن دێنن یا شو دەکەن (٢) ژن هێنانی پیاوێکی بەساڵاچوو لە پاش مردنی ژنی پێشوی یا تەڵاقدانی

تەڕ پۆش– یەکێ بەساڵاچوو کە بەرگ‌و کاڵای جوان لەبەرکا

تەڕپیر– پیری دڵ زیندوی بەهەوەس

تەڕدەس– تەڕدەست : مەزبوت، چالاك، ئازا لە ئیش‌و کارا

تەڕ دەسی– تەڕ دەستی: چاپکی، چالاکی لە ئیش‌و کارا

تەڕدەم– تەڕ زمان– تەڕ زوان: قسەزان‌و بەگفت‌و لفت، مەردومی قسەزانی قسە رەوان

تەرك: کێر

تەڕە– سەوزەو میوە

ئەمساڵ تەڕە زۆرە

تەڕە تۆڵەکە- شتی هەرزان

گەنم بوە بە تەڕە تۆڵەکە

تەڕ نەبوون- تەریق نەبوونەوە

تەڕنابێ- تەریق نابێتەوە

تەڕو ووشك- باش و خراپ

تەڕو ووشکیان گرت

تەڕە ماش- شتی نەهێژاو بێ نرخ، هیچ و پێچ

گزیر بەتوندیەوە گوتی، تەڕەماشی تێدا ماوە

تەرزە کوت، تەرزە شکێن کردن- سەرزەنشت کردن و ئامۆژگاری کردنی یەکێك لەسەر یەکێك

تەرزە کوت دام گرت

تەزین- تاسان

ئاسۆ بە قسەکەم تەزی

تەسلیم- گیان دەرچوون

تەشپی تڕێن- مەردومی زۆر خۆر

تەشەنە کردن- گەورەتر بوونی بەڵاو چورتم کە زوو چارەسەر نەکرێت، نوێ بوونەوەی بەڵایەك لەمەو پێش ڕووی دابێ

تەشی ڕستن- مەرایی کردن، لەگامی کردن بۆ یەکێك

تەقڵە پێ لێدان- زەرەرو زیان گەیاندن بە یەکێك بەفێڵ

تەقڵەم پێ لێدا

تەقە تێ کەوتن- دەست بەهەڵاتنی بەکۆمەڵ کردن، چۆڵبوونی شوێنێك لە مەردوم بەرە بەرە

بازاڕ تەقەی تێکەوت

تەقینەوە- بڵاو بوونەوەی خەبەرو باسی نهێنی

باسەکە دوێنێ تەقییەوە

تەقاندنەوە- بڵاوکردنەوەی خەبەرو باسی نهێنی

تەقین ، شەق بردن- خەم خواردنی زۆر لە کارێکی ناڕەوا کە لەبەر چاوت بێت‌و نەتوانی قسان بکەی

وەختە بتەقم

تەقە تێکەوتن- رەوین، هەڵاتن

تەکان- شەق، پاڵدان

دایە بەر تەکان

تەگە- مرۆی لاسارو نەساز

ئەو تەگەیە قسەی لەگەڵ ناکرێ

تەلاق دان- لە رووی سوکیەوە بە کەسێ دەڵێن کە لە کاری لە لایەن خاوەن کارەوە دەرکرابێ

تەڵە دانانەوە، داو دانانەوە- گرتنی یەکێ بە فێڵ‌و گزی

تەڵە تەقێن- فێڵبازو خاپینۆك، مەردومی فێڵباز

تەڵە نانەوە- گزی کردن بۆ فریو دان

گەردون لە گەڕەو هەزار تەڵەی ناوەتەوە

خەیامی هەژار

تەم- خەم‌و کەسەر

تەمی بەسەردا باری

تەم‌و مژ- بە رۆژانێك دەوترێ کە گرتن‌و پشێوی هەبێ

ئەو تەم‌و مژە رەوی

تەنك- هەژارو نەدار

حاڵی مە تەنك بوو

تەنگدەس، تەنگدەست- نەدار، بێ پارە، بێ ماڵ

تەنگە گر- بە یەکێ دەڵێن کە قسەی ڕەق بکات

تەنگە گرتن– قسەی گرجو برو تورەکەر، تووڕە بوونی یەکێك لە وتار یا کرداری یەکێکی تر

تەنگەی ئەو کابرایەت بۆ گرت

تەنگە لێ کردنەوە– ئاسوودە بوون

تەنگە نەفەس– بێ سەبر

بە قسەکەم تەنگە نەفەس بوو

تەنگە نەفەسی– بێ ئارامی

تەنیا باڵ– کەسێك کە بێ یارمەتی دەربێ، بێ یاریدەدەرو هاوکار

من تەنیا باڵم

تەون و بەست– فڕو فێڵ

ئازادو نەوزاد تەون و بەستیان بەیەکەوە هەیە

تۆپ هاویشتن– نەمانی کەسی لەکاری بەهۆی زەرەرو زیان وێکەوتنەوە

تۆلکە – زۆر هەرزان

تێبەربوون– بەرپەرچ دانەوەو قسەی ناڕەوا کردن

ناوێری قسەی بکەی تێت بەردەبێ

تێبەردان– هاندان و دنەدانی یەکێك

ئازادم لە ئاسۆ بەردا

تێچاندن، تێگوشین– شەیتانی و شۆفاری کردن، قسەی خراپ کردن دەربارەی یەکێك لای گەورەیەك

تێچێن، تێکوشین– ئەوەی شەیتانی و شوفاری لە خەڵك دەکا

ئەوەی سرتەی خەڵکت بۆ دێنێ لای خەڵکیش بۆت تێ دەچێنێ

شەرەف ل ١٢٧

تێر– زۆر

تێر گریام

تێر – زۆر بە دڵ، لە ناخی دڵەوە

تێر تەماشام کرد

تێر – دەوڵەمەند، زەنگین

تێری– دەوڵەمەندی، زەنگینی

ئازاد کابرایەکی تێرە

تێر بوون– بە کەسێك دەڵێن کە بێ نیاز بێ لە شتێك

تێرم خواردووە لە کارەکەم

تێر نەخۆر– چکوس، رەزیل

تێر خواردن– بێ نیاز بوون لە کارو کردەوەیەكو تێگەیشتنی

تێرم خوارد لە بەڵێنەکانی ئازاد

تیراوە– کارێك چارەسەر نەکرێتو زیاتر ببێتە هۆی ئاژاوە پەیدا کردن

تیروپەر– زۆر باش

تیژ– رشت

تیژتر– رشتر

بەڵام ئەوان جارلەجار تیژتر دەبوونو دنەی پاشیان دەدا

شەرەف نامە ل ٥٢٨

تێر نەخواردن– تێ نەگەیشتن لە نیازو مەبەستی کارو کردەیەك بەردەوام بوون لەسەری

تێرت نەخوارد لە ماندوو بوونی رۆژانەت

تێرو برسی– دەوڵەمەندو هەژار

تێك کردنەوە– هەموو گیان شکاندن

لەشی هەموو تێك کردەوە

تێکەڵی– دۆستایەتیو خزمایەتی، ئاشنایەتیو هاتوچۆ کردنی دوو کەس لەگەڵ یەکا بە گەرمو گوڕی

تێکەوتن، تێ کەتن– تووشی زەرەرو زیان بوون

لەو ماملەیەدا تێ کەوتم

تێکوشین– شەیتانیو شۆفاری کردن

تێنو، تێنی– ئارەزوو، تاسەی، کارێك یا کردەوەیەك یا هەواڵێکی نەزانراو

"…. ئەمجارە خەڵك زیاتر تینوی دەنگوباس بوون…"

گەدا– ل ٤٢

تینوو تامەزرۆ– ئارەزوو، تاسەی كارێك یا كردەوەیەك یا هەواڵێكی نەزانراو

…. شایەرەكان بەیتی دمدمیان بۆ خەڵكی تینوو تامەزرۆ گوتووە….

## " ج "

جادووگەر- فێڵباز

پیرێژنی جادووگەر واز ناهێنێ

جاش، خۆفرۆش، بەکرێ گیراو- ئەوانەی هاریکاری دوژمن دەکەن دژی میللەتی خۆیان

چەندم پێ گوتی جاشێتی مەکە

تفەنگی کەندی لە شانت مەکە

جاشك و گۆلك- چەند کەسێکی بێ عەقل و گەمژە

جاشایەتی- کاری پیاوی خائن

جاشایەتی کاری نامەردانە

جامباز- فێڵ بازو خاپینۆك

بەڕاستی خەسویەکی جامبازو زۆرزانی ئەبێ

ژان ل ٦٤

جامبازی- فێڵ بازی و خاپینۆکی

جام زرنگاوە، تاس زرنگاوە- بەدناو بوون بە هۆی کرداری ناڕەواوە

جانگ- جەوهەر ، ڕەسەن

جانگ حیز- بێ غیرەت و ترسنۆك و مۆن، بێ جەوهەر

جاونانەوە- کەسێك کە زۆر هاتوچۆ بکات، هاتوچۆ کردنی زۆر بەلەز

جاوینەوە، جوینەوە- دووبارە کردنەوەی وتەیەك، چەندپاتە کردنەوەی قسە

قسەی زۆر دەجویتەوە

جغارە کێش- ماوەو مەودایەکی کەم

جغارە کێشەك لەلای دانیشتم

جەرگ، جگەر گۆشە، ڕیشەی جەرگ- ڕۆڵەی ئادەمیزاد

ژن لەتاو جەرگی بەو زگ سوتانەی کارێکی دەکرد هەر مەگەر دایکی دوو گور غەریبان بزانێ چۆنە

شەرەف ل٧٢٣

جەرگی جەرگ- ڕۆڵەی ڕۆڵەی ئادامیزاد

لایە لایە جەرگی جەرگم لایە لایە

جەرگاوس- غەمبار، مەینەتبار

جەرگاوسی کردم

جەرگاوس کەر- هەراسان کار، وەڕزکار

جەرگ بڕ- جەرگ برژێن- بەسەر هاتی پڕ لەخەم، بەڵای گەورە

".... کاتی وەڵامی کتوپڕی جەرگ بڕی ئەو شێری میسری‌و شێری مەیدانە گەیشتەوە...."

شەرەف نامە ل ١٦٤

جەرگ بڕان- تووشی بەڵای گەورە بوون

جەرگ بڕین- تووشی بەڵای گەورە کردن

جەرگت بڕیم خوا جەرگت ببڕێ

جەرگ پارە پارە- تووشی بەڵا بوو

... هەر پەنجا شێست ڕۆژێکە جەرگت پارە پارە کردوومە

غەوارە- ل

جەرگ پڕبرین- فەرزەندەو خۆشەویست مردوو

"... بەدەم قوڵپی گرینەوە بە جەرگی پڕ برینەوە لەبەر خۆیەوە وەی ورتاند..."

شەرەف ل ٧٢٠

جەرگ ڕەش بوون- زۆر خەم خواردن لە کەسێ یا لەکارێکی ناڕەوا

جەرگ ڕەشکردن- زۆر خەم دان بەکەسێ

جەرگ سۆز، جگەر سۆز– غەمخۆر، یەکێك کە بەتەنگتەوە بێ و خەمت بۆ بخوات لە کاتی تەنگانەدا

جەرگ سوتان، جگەر سوتان– مردنی فرزەندە، مردنی منداڵی ئادەمیزاد

جەرگم سوتا

جەرگ سوتاو، جگەر سوتاو– منالْ مردوو، ئەولاد مردوو، یەکێ کە ڕۆڵەی مردبێ

جەرگ سۆت– خەمخۆر لەکاتی تەنگانەدا

جەرگ قایم– ئازا، ڕەشید، بوێر، بەغیرەت

هەروەها نەدەبوو ئازایەتی و جەرگ قایمی‌یەکەی لەکن بدرکێنی

کور ئۆغلی ل ٤٩

جەرگ قایم، جەرگ گەورە– بەسەبرو حەوسەڵە، بە پشی

جەرگ لەت لەت– غەمگین، زۆر پەریشان

هەموو جەرگم لەت لەتە ، لە دوری ئەو نازەنینە

فۆلکلۆر

جەرگ مژ– بێ داد، زۆردار، ستەمکار

زوحاك پاشایەکی جەرگ مژ بوو

جەرگ و دڵ بەربوونەوە– تاسان، زراو چوون

لەگەڵ هاواری کرد جەرگ و دڵم بەربوونەوە

جەرگ هێشان– خەم خواردن و توانا نەبوون بەرامبەر کاری ناڕەوا

ماڵی میللەت دەدزن جەرگم دێشێ

جەرگە– خۆشەویستە، ئازیزە

جەرگم باشی

جگەر برژین– کاری گەر، ناخۆش

_جگەر دۆز– جگەر کون کون– جگەر پارە پارە– جگەر بریندار)– غەمبارو غەمگین

تا ئێوارە شەپۆرم بێ          نالەی جگەردۆز

دیلان ل١٣٣

جگەر گورگ– هۆی فریودان و هەڵخەڵتاندن

جەژن، گیژینە– رۆژی خۆشی و شادی

بە نەمانی داگیرکەر جەژنمانە

جەندرمە– ژنی هارو هاج و بێ شەرم

جلەگا– بە یەکێ دەڵێن کە هیچ بایەخی نەبێ و بە پیاو حساب نەکرێ

ئەگەر ئەو کارە نەکەی؟ مانای وایە جلەگای

جلەو توند گرتن– مەجال نەدان بە کەسێ کە لەژێر دەست خۆت دا بێ

جڵەودار– مشوور خۆر، لێزان لە کارو باراندا

بەڵام دەبێ بۆ هەڵسوڕاندن و بەڕێوەبردنی کاروباری رۆژانەتان جڵەودارێکتان هەر هەبێ

بزن و گورگ ل ٨٩

جڵەودانە دەست– فەرمان پێ دان بە کەسێ لەسەر کاری بۆ کار ڕاپەڕاندن

جڵەو شلکردن، جڵەو شۆڕکردن، لغاو شلکردن، لەدوودان– بەرەڵا کردنی منداڵ و بەردەست وەگوێ پێ نەدانیان، ئازادی دان بە منداڵ یان ژێردەست کە کار بە ئارەزووی خۆیان بکەن

جڵەو گیری– کوسپی سەر ڕێگا، بوار پێ نەدان بۆ کردن یا وتنی شتێک

جڵەوگیری کوڕەکەت بکە لە هاوڕێی خراپ

جڵەو لە دەست دەرچوون– (١) فەرمان ڕەوایی لە دەست نەمان، (٢) دەسەڵات لە دەست نەمان

جڵەو هەڵتەکاندن– جڵەو هەلکێشان– نەهێشتنی ئەنجامدانی کردەو کارێک

جوتەی سەران– دوو هەواڵی هەردەم بەیەکەوە

جوتە وەشێن– ئادەمیزادی قسە ڕەق

جوچکە لەقی– مەرایی و لەگامی کردن

جۆشدان- هاندان

جۆش سەندن- گەرم بوونی كۆڕی بەزمو مۆسیقا

جوجكە ترسێن كردن- بە بچوكی ترساندن

ئەو خەڵكە جوجكە ترسێن كرایە

جۆكەر- كەسێك لەگەڵ هەموو كەسێكو هەموو زەمانێك خۆی بگونجێنێ

جوینەوە- زۆر گوتنەوەی قسەیەك

قسان زۆر دەجویتەوە

جیوەی تێكرایە، بیبەری تێكرایە- كەسێ لە هیچ شوێنێك ئارام نەگرێ بۆ دانیشتن

جێ پێ كردنەوە- سەرتای جێگیر بوونی كەسێ لە شوێنێ

جێ پێ لەقبوون، جێ پێ لێژبوون- كەمو كورتی هێنان لە پایەو مایەدا

زۆری نەمایە جێ پێی لەق بووە

جێ پێ لێژكردن- لە پلەو پایە هێنانە خوار

.. میرەبەگ جێ پێ لێژ كراو نەیتوانی هەراو هەلكاو...

شەرەف ل٥٢٤

جێ چاو تێدابوون- هومێد پێ بوون

مزیر گوتی: ..نا..نا.. هێشتا جێی چاوانی تێدا ماوە

بۆرە ل٤٧

جێ خۆش كردن- مانەوە لە شوێنێك بە خاترجەمی

جەهەنەم، دۆزەخ- شوێنێك كە لەبەر كارو كردەوەی نارەوا ژیانی لێ نەمێنێ

"... ماڵەكەشی لە كوڕو باوكی كردبوە دۆزەخ..."

هەیاس

جەهەنەمی- زۆر خراپو نالەبار

## " چ "

چار پێ– بە مرۆی بێ ئاوەزی گەمشۆ دەڵێن

چارچاو، چار چاڤ – ووشیارو بە ئاگا

چارداوەر– مرۆی بێ شەرم

چارشانە، چوار شانە، چوار هەنگڵ– مەردومی ناوشان پان پۆڕ

چار قاپ– بێ ئەدا، بێ شەرم

چاك بین– گەش بین، هزر باش

چاك كردن– ئەسپ خستنە سەر ماین، ماینو ماكەر لەفەحل لێنان

چاڵ– زەرەرو زیان

چاڵی بۆ خەڵك لێدەدا

چالومار– دوو بەڵا

كەوتبیمە نێوان چالو مارێ

چاو– پرو پاگەندە

مردنی قوبادە هەر چاوە

چاو بەچاو كەوتن– یەكتری دیتنەوە

چاوبرسی، نەزیر، چاوچنۆك، چاڤ برچی– چكوس، كەسێك كەبەرچاوی تەنگ بێ لە شت خواردنا

سەرەڕای ئەوەش هەموویان زۆر چاوتێرو كەم چاو نەزیرنو هەرگیز گازاندە لە بەختی خۆیان ناكەن

شەرەف ل٣٨

چاوبەرە ژێر– تەریق، فهێدكار، خەجاڵەت، مەردمی تەریق بەرامبەر بە یەكێك

چاو بەرە ژێرمان مەكە

چاو بەست، چاو بەند، چاوبەن– فێڵباز، خاپینۆك، خەڵەتێن،هەڵخەڵتاندنی یەكێك لە كارێكا

ئەم قسانەی تۆ چاوبەستن
چاوبەستن- مەردومی فێڵ باز
ئازاد پیاوێکی چاوبەستە
چاوبەستی- هەڵ فریواندن و هەڵ خەڵەتاندنی مەردوم
نەوزاد زۆر چاو بەستی ئەکا لە مەردوم
چاوپان- مۆن و کەتن کەر
(چاوپۆشان، چەم پۆشی، چاو پۆشی، چاوپۆشین)- لێبوردن، بووردنی تاوانی یەکێك
چاوپۆشیم لە هەڵەکانی کرد
چاوپێ هەڵنەهاتن- رك لێبوونەوە لە ئیرەیەوە
"... سولەیمان سۆسەی کردبوو: خان چاوی پێ هەڵنایە..."
شەرەف ل٢٢٠
چاوتاریك- ڕەش بین، کەسێ دوارۆژ بە خراپ دەزانێ بە هیچ دڵخۆش نیە
چاو تاریك بوون- (١) ڕق هەستانی زۆر (٢) تورە بوون (٣) بەزەیی پێداهاتنەوە
چاو ترسێن- پەند وەرگرتوو، تەنبێ بوو
چاوم ترسایە لەو کارە
چاوتروکانێك- ماوەیەکی یەکجار کەم
بە چاوتروکانێك دەتگەمێ
چاو توند، چاو قایم- نەترس، بەغیرەت
چاوحیز- ئەوی بە خەیانەت لەژنی خەڵك دەڕوانێ
چاوحیز کردنەوە- بۆ کاتێکی زۆر بە خیانەت تەماشا کردن
چاوحیزی- نەنگی و شەرمەزاری
چاو دادرون، چاو نوساندن، چاو قەپات کردن- بەرتیل دان بەکەسی بۆ مەیسەر بونی کارێك

چاو داخستن، چاوبەردانەوە، چاوشۆڕکردن– شەرمەزاربوونی یەکێك، سەرهەڵنەهێنان لە شەرمان

چاوڕوون– بەختیار، شادمان

چاو ڕوون بوونەوە– شادمان بوون، خۆش حاڵ بوون

چاو ساخ ، چاوساغ، ڕێ ناس، ڕێوان، ڕێبین– بەو کەسە دەڵێن کە شارەزایی لە کارێکدا هەیەو ڕێبەری دەکا، شارەزا لەڕێ

میر حوسێن کەپێشەنگ‌و چاوساغی لەشکر بوو بردنیە چیای گەلاڵە

شەرەف ل٥٢٦

چاوسپی بوون– (١) مردن، (٢) زۆر ماندوو بوون‌و هەوڵدان بۆ بەئەنجام گەیاندنی کارێك

چاوت سپی دەکەم

چاو سوورکردنەوە، چاوسۆرکردنەوە– ترساندن، هەڕەشە کردن ، هەڕو گیف کردن، گەڤ کردن

چاو سووری– ئازایەتی، نەترس، بوێر

چاوشکان– ترسان، نەترەچون، زراوچون (٢) پەند وەرگرتن‌و تەمبێ بوون

چاو شکاندن– (١) ترساندن، (٢) سوك‌و چروك کردن

چاو شۆڕ– خەجاڵەت، تەریق، فەیدکار

چاوشۆڕی– فهێت کاری، شەرمەزاری، خەجاڵەت باری

چاوقایم– (١) بێ شەرم (٢)نەترس، بەغیرەت

چاو قوچاندن، چاوپۆشین– خۆنەبان کردن لە کارێ یا کردارێ

چاوکراوە– شارەزاو لێزان، تێگەیشتوو

چاوکرانەوە–شارەزا بوون بەڵەد بوونی یەکێك لە دنیادا

چاوکراوە– شارەزا، لێزان

چاو کردنەوە– ئاگاداربوون لە دنیا ناسینی خەڵك

چاوگەرم کردن– سەرخەو شکاندن، سوکە خەو کردن، بۆرژان

چاو لێبوون– یارمەتی دانی کەسێکە هەژار

چاو لەدەست– ئاتاج ، (٢) بەنیازی بەخشین و خەڵات

چاو لەدەستی– نیاز، ئاتاجی

چاوم لەدەستی خەڵکە یارمەتیم بدات

چاولەبەر نان، چاودەبەرنان– کەم کورتی قبول کردن

کەس بۆ کەس نابێ چاو دەبەربێ     هەر کەس دەیەوێ زل و لەسەربێ

شەرەف ل٣٦

چاومار– زۆر زرنگ و وریا

چاونەترس– ئازا، بەجەرگ، بوێر، رەشید

"... کۆنە گورگی باران دیدەو چاونەترساو لە مەردایەتی..."

شەرەف ل٣٤

چاو نەکراوە– بێ ئەزموون، نائاشنا بەکار، پیاوی هێشتا خاو

چاو هەڵگلۆفین– هوشیار بوونەوە، زانین لە خەراپەو چاکە

چاوەش– زۆروەر، بێ شەرم

چخە، چغە– بۆ توانج تێ گرتن بەکاردێ

"... رەشید ئاغا: دە چەغەبە ، دەویت باب..."

گەدا– ل٥٣

چراغ– ماڵە گەورە

چرای چاو– زۆر خۆشەویست

چرای چاوم بێ نایدەمێ

چزو پێ گەیاندن– زەرەرو زیان بەیەکی گەیاندن

دەگاتە کێ! چزوی دەگەیێنێتێ

چزە لێ هەڵسان– ئازارو زیان گەیاندن بە یەکێك لە ناکاوێکدا

چقڵی چاوی دوژمن– ئازاردەری دوژمن

چكڵه چزی- پەیاكردنی شت بەكەمو كوڕیی‌و بەڕنجی شان، ماندوو بوونی زۆر

چڵه پۆپه-ئەوپەڕی

(... لەودەم وپیتی ئەوسەرداره سەرزەمینی میهر گەیشته چڵه پۆپەی گەشەداری

شەرەف- ل١٦

چڵكاو خۆر-(١) نۆكەرو كارەكەری بێ نرخ‌و بێ قەدر

(٢) كەسێ بۆسوودی تایبەتی خۆو بۆ قازانجی داگیركەر كاردەكات

چڵكی دەست، قرێژی دەست- بێ نرخ‌و بێ بایەخ

ماڵی دنیایی چڵكی دەسته

چڵكی دەسته ماڵی دنیا وەك دەڵێن

هێمن

چڵمن- به مرۆی نابووت دەڵێن

چنا- ڕەت كردنەوەی هەموو كردەوەو كردارێك

هی وی هەر چنایه

چناگه شكیاگ- زۆر بڵێی چەقه سرۆ، مەردومی سازنده

چنگه چركی، چنگه كرێ- ژیان گوزەراندن زۆر به ناخۆشی

به چنگه چركی دەژین

چنگ پان كردنەوه، دەست پان كردنەوه- پارسەكی كردن، گەدایی كردن، دەروزه كردن

چنگ لێ گیربوون، دەست لێ گیربوون- سەرەتای حاسڵ كردنی كارێكی گرنگ

چوار باڵ- خڕمچون، هەردوو دەست‌و هەردوو پێ

چوار باڵ كردن- بریندار بوونی هەردوك قۆڵ به گولله

چوار پەل قەوی- گیانداری قەڵەو، پیاوی قەڵەوی پتەوی تێك سمراو

چوار پێ– بە مرۆی بێ عەقڵ دەڵێن

چوار چاو– زیرەك و بەئاگا

چوار خاڵ کێشان– ڕیسول کردن، ئەتك کردن

چۆك لەرزین، لێولەرزین، لاق لەرزین، قەلەب لەرزین– کاتێك کەسێ تووشی ناخۆشیەك دەبێ زۆر دەترسێت واتە زۆر ترسان

چۆپە، چەپە– نەزان لەکاردا

بۆ تۆ چۆپەی؟

چۆك دادان– بەزین و تەسلیم بوون

چۆکمان بە دوژمن دادا

چۆك شکان– تاسان

دێزە کە چاوی بە گزیرو مزیر کەوت لە ترسانا چۆکی شکاو زمانی گیرا

بۆرە ل٦٣

چولکە شکێن– نێوان تێکدەر، شەیتانی کەر لە نێوان خەڵکا، یەکێك کاری خەڵك تێك بدات

چۆلەکە بکوژ، کێشکە کوژ– مرۆی زیندۆ، ئادەمیزادی نێرینە ، کیر میز

کێشکە کوژیان نەمایە

چوونە ژێربار– قایل بوون، رازی بوون

چوونە سەر– ڕێکەوتنی کارێك و بڕانەوەی بەیەکجاری

چوونەلا– دروست بوونی پیاو لەگەڵ ژنیا

چەپڵە بەقوزی– دەرکردنی بەسوکایەتی، دەرکردنی یەکێك لە شوێنێك بە ریسواو هەرا

چەپڵە لێ کوتان– دەرکردن و سوکایەتی بەسەر هێنان

چەرچی– مامەلەچی فێڵ باز

چێلم زایە– کاری باش و بەسوودم تەواو بووە

چەرخ لە جەمبەر کێشان، چەرخ لە جەمبەردان- ئازاردان، بەیدەست کردن و سزادانی یەکێك

چەرخیم لە جەمبەر کێشا- واتە ئازاریم دا

چەقەڵ - مرۆی فێڵ باز

چەکەرە کردن- پاڕابوون، حولحولی

چەلاو خۆر، بەرماوەخۆر- خزمەتکار، گزیر

چەڵتوك تێ فرێدان- قسەی خەراپ کردن لە کاری ئەم و ئەودا

چەناگەدان- زۆر قسە کردن

چەنە کەتن- زۆر قسە کردن

چەنەم کەت لە گەڵی

چەور- دەولەمەندو پارەدار

چەورو شیرین- فریودەر، مرۆڤەلەتێن بە قسەی خۆش

چویتە پشتی شێری- زۆر بە زەحمەت کەتیە

ئیش چویتە پشتی شێری

چیا - مرۆی زۆر ئازاو نەبەزو ماندو نەزان

من چیام خۆ نابەزم

چیای سەفینی گرتیە، قەلای مەریوانی گرتیە- کەسێ کارێکی ئاسانی کردبێ کەچی خۆی پێوە هەڵکێشێ

چیر کیسە- رژد، رەزیل، قرچۆك

... هەموو ژیانی وا بە سیسی و چیر کیسەیی و دراو زۆری نان نەخۆری بەسەر برد...

شەرەف ل\٤٥١

چیلکە لە پیسایی وەردان، دار لە پیسایی وەردان- زۆر دووبارە کردنەوەی قسەیەکی نابەجێ یا کارێکی نابەجێ کە زەرەرو زیان زیاتر بکات

## ( خ )

خاران، لەکار دەرهاتن- لێزان و زانین لە کارێك بەهۆی ماندوو بوونی زۆر

خاراندن- راهێنان لەکار، فێرە ئەزموون کردن

خاراو- راهاتوو لەکار

خافل، بێ خەبەر لە ژیان- بێ ئاگا

خاك بە تورەگە کێشان، خاك لە تورەگە کردن- وڵات وێران کردن، لەبەین بردن

خاکت لە تورەگەی دەکەم

خاکە سەر، خاکسار، خاك بەسەر- مەردوومی هەژارو بێ نەوا، بەلەنگاز، بێچارە

خاکە ساری- بەلەنگازی ، بەدبەختی، کلۆڵی

چەند شاران گەڕام چەند خاکە ساری

فۆلکلۆر

خاك بەسەر کردن- تووشی بەڵا کردن، زەرەرو زیان لێدان

هەموو گوناهی ئەم "مەلا بەدرە"یە ئەو خاکی بەسەر خەڵکی ئیرە کرد

زەمبووك ل١٦٠

خاكەوپا- پارانەوە، لالانەوە، ناورانەوە

چووە خاكەوپای

خاکی- مەردوومی بێ فیزو کە ئارەزووی پۆشینی کالای جوانی نەبێ، مرۆی بێ فیزو خۆبەزل نەزان

خام، خاو- فەقیرۆکەو کەم زان

خان- شوێنێك بۆ هەموو کەس بتوانێ بچیتێ کەس لێیان نەپیچیتیەوە

خانەبا- جووڵەو بزوتنەوەی سەبری ئەندام

خانە خراپ- بێ بەخت و کلۆڵ

ئەو کەسەی بێ کەس نیەو خانە خراپ

هێمن

خانە گومان– مەردومی بەدگومان

خانەنەماو– بێ شەرم، بەدرەوشت

خاو بوونەوە– بێ هومێد بوون لە کارێك

خاو کردنەوە– ناهومێد کردنی یەك لەسەر کارێك یا کردەوەیەك

خاوێن–باش، چاك، بێ گەردو عەیب

هەرێم کوڕێکی خاوێنە

خپ کردن– کوشتن

کورەیان خپ کرد

ختە ختە دان– هاندان و گاڵدان

خدری زیندە– کەسێ لە کاتی تەنگانەو ساتی ناخۆش دێتە هانات و یارمەتیت دەدات

خراپ– ژنی سۆزانی

خراپ– توندو تیژ

خراپ بەگژیدا هات

خلیسکان– هەڵخەڵەتان، فریودان

خلیسکاندن– هەڵخەڵەتاندن

خم خانە– بشێویو کەس ئاگای لەکەس نا

ئەو شارە خم خانەیە

خم شێوان، خم شێویان– ئاژاوەو بشێوی

خم شێوێن– ئاژاوەچی

خم لێ شێوان– کلۆڵی، لێ قەومان

وام بەسەر هاتووە خمم لێ شێواوە

"... شا کە بەو بەڵای زانی خمی لێ شێواو زەمان بەگی هەمە کارەی..."

شەرەف ل٥٤٢

خۆ ئارداوی کردن– بوختان بەخۆ کردن لە کارێك کە نەتکردبێ

وەرە ئەولای خۆت ئارداوی مەکە
خوار– نالەبار لە دۆستی و مامڵەدا، ساختەچی
گەورەم ئەگەر بە ئاستەم لەم بارەیەوە خواریەکت لە بەندەی خۆت دیت خوێنم حەڵاڵت بێ
بۆرە ل٥٢
خوار رامان، خوار تەماشا کردن – بەخراپە تەماشا کردنی یەکێكو بۆ زیان پێ گەیاندنی
"... هیچ کەسێك نەی دەتوانی لە هەمبەری سەر هەڵێنی و خوار ڕامێنی..."
شەرەف ل٥٣١
خوار دەست– گزیرو خزمەت کار
خۆ نەداو خستن– خۆ تووشی بەلا کردن
خواردن– زەوت کردن و نەدانەوە
پارەکەیان خواردم
خواردن– سزا چەشتن
خواردن– بێزار کردن، هەراسان کردن
خوارزا– وشەی ڕێز لێنان لە گفتوگۆدا
خوارزا چۆنی
خۆبادان– ئەملاو ئەولا کردن، ئەولا ئەولاکردن– بڕو بیانو هێنانەوە بۆ خۆ دەرباز کردن یان نەکردنی کارێك
خۆبردنە پێشەوە– هەوڵدان بۆ وەدەست هێنانی پلەو پایە
خۆبەردان– زیادە خەرج کردن کەلەوەپێش نەت کردبێ، خەڵە خەرجی، ماڵ بەفیرۆدان
خۆتاڵ کردن– سووك بوون بەهۆی کارو کردەوەی نالەبارەوە
خۆتڕاندن– زەرەر بەخۆ گەیاندن، خۆ تووشی بەلا کردن
خۆ تۆزاوی کردن– بەسەر خۆدا هێنانی کارێك کە نەکراوە

خۆخواردن– پیش خواردنەوە لە خەم‌و خەفەتان

خۆخوراندن– خۆ ئامادە کردن بۆ بەخشینی پارە یان شتێك

خۆخۆر– دوژمنی گەل‌و قەومی خۆ

خودای بناسە– وژدانت هەبێ

خۆرهەلاتن– ئازادبوون، سەرکەوتن

خۆری سەرفرازی هەلات

خۆش– پەلە، لەز

خۆش برۆ

خۆشیرین کردن– ووتن‌و دەرکردنی شتێك لایەکێك بەرەنگێك کە پیٚ‌ی بچیتە پێشەوە، کاری وا کردن کە خۆشەویست بیت

خۆ لەدارو بەردان– زۆر هەوڵ‌و تەقەلادان

خۆکوشتن– خۆ هیلاك کردن، لەسەرو سینگ دان لە شیوەنا

خۆکەر کردن– بەئانقەست گویٚ نەدان بە فرمان

خۆت کەر مەکە– خۆت بیٚ عەقل مەکە

خۆکرینەوە– خۆ رزگار کردن لە بەلایەك

خۆ هەل کردن– خۆئامادە کردن بۆ راپەراندنی کاری

خوێن– قەرەبوو کە لە پیاو کوژ دەسێنریٚ، تۆڵە

"... دەبیٚ هەموان لە خوێنی کوڕی خۆی‌دا بکوژی..."

شەرەف ل ٨٥

خوێن ئەستێن– تۆڵە ئەستێن

هەموو خەلکەکەی بۆتانیش وێکرا دەگەلیان هروژاو بونە خوێن گرو خوێن ئەستێن

شەرەف ل٢٠٦

خوێن خوار– دوژمنێکی وا کە بە خوێنی سەرت تێنو بێت، دوژمنی خوێنی

خوێن خواردن– خێن خواردن ڕق لێبوونەوە بە شێوەیەك كە كوشتنی بێتە سەر

خونخوار، خوێن ڕێژ– زۆردار، ستەمكار، دڵ ڕەق، زاڵم

تا بزانێ ئەو شا عەبباسەی ئەو باسی دەكا چ دێوەزمەیەكی خوێنخۆر بووە

دم دم ل١٢

خوێن ڕژان– شەڕو تێك هاڵان كە پیاوی تێدا بكوژرێ

خوێنیان لە بەین دایە– واتە لە یەكتریان كوشتوە

خوێن هەلچون– ڕق هەستان، توڕە بوون

خەت نەخوێندنەوە– گرنگی پێ نەدان

ببوە هەر كەس هەر كەس و كەس خەتی شاژنی نەدەخوێندەوە

شەرەف– ل١٠١

خوێن ڕژاندن، خوێن كردن، خوێن ڕشتن– كوشتنی مەردوم ، پیاو كوشتن

خوێن ڕژاو– كوژراو

خوێن ڕێژ– پیاو كوژ، بەیەكێ دەڵێن كە مەردوم زۆر بكوژێ

لە زوڵم و زۆرداری و خوێن ڕێژی بەملاوە چیتر نازانیت...

بۆرە ل٥١

خوێن ڕێژ– زۆر كوشتنی مەردوم، پیاو كوژی

خوێن سارد– یەكێك كە درەنگ ڕقی هەستێ، بە پشی، پیاوی لەسەرخۆو هێدی، بە حەوسەڵە

خوێن ساردی– درەنگ ڕق هەستان، پشو درژی، سەبرو حەوسەڵە

خوێن شیرین– مەردومی جوان و قسە خۆش، ڕەزا سوك

خوێن خڕ كردن– زۆر ڕق لێبوونەوە لە كەسێ

خوێن كردنە كاسە– ڕەش كردنی یەكێك لای یەكی تر بە جۆرێك زۆر خراپ، جزیادان و زۆر هێنان

خوێن كردنەوە، خێن كردنەوە– تۆڵە لێ سەندنەوە

خوێن کولین، خوێن هەلچون– ئارام لەبەر بڕان و تورە بوون

"... ئابرویان کەوتۆتە دەست دوژمن، ئیتر خوێنیان کوڵیو بەدڵ پڕی بایان دایەوە

شەرەف ل٧٥

خوێن لەسك– کەسێ یەکێکی کوشتبێ

خوێن مژ، خوێن خۆر– زۆرداری ستەمکار

خوێنین، خوێن ڕژان– شەڕی گەورە کە زۆر کەسی تیا بکوژرێ

دوای ئەو خۆپیشاندانە خوێنینەی نزیکەی سەد کەسی تیا کوژرا

ژان ل١٤٤

خەزینە– بەکاری بەسوود دەڵێن

خەسان– ترسان، تۆقان

خەساندن– ترساندن، ترقاندن

خەڵکیان خەساند

خەساو ترساو

خەنجەر– قسەی بەمانا بەکەسێ گوتن

قسەکانت هەمووی خەنجەرە

خەنجەر لەکا– بەلاش، شتی بە خۆڕایی دەست کەوتبێ

خەنجەر لێ سوونەوە– گەف لێ کردن، هەڕەشە لێ کردن

خەنجەر لە پشتەوە لێدان– بە نامەردانە لەکاتو ساتی ناسکی کەسێ دەست بوەشێنێ

خەنجەر لە یەك سوین، تیغ لەیەك سوین، چەقۆ لەیەك سوین– هەڕەشەی کوشتن لەیەکتری کردن، گەف لە یەکتری کردن

خەنجەری دەبانە– زۆر مەردانەیە

خەنجەرەکت لێدابام خوێنم لێ نەدەهات– قسەی ناخۆشی نابەجێ کە پێت دەڵێنو ناتوانی قسان بکەی

خەون- (١) راستیەکی چاوەڕوان نەکراو (٢) خۆشیەك کەسێ بێنیی بێ و لەدەست چوبێ

خەیاڵ شرین، خەیاڵ پڵاو- داهاتوی خۆش هەر بەقسەو لێکدانەوەی مێشك

خین- زۆر سۆر

ئەو شەفتیە دەڵێی خینە

## " ح "

حالّ خۆش- باشی له گوزەرانی ژیاندا

حاڵمان خۆشه

حوج- بالا بەرزی ناشیرین

ئازاد دەڵێی حوج بنی حەلاقه

حۆری- فریشته- پەری- به ژن یا کچێکی جوان دەڵێن

کچەکه دەڵێی حۆریه

حوشتر- جنێوه به مانای بێ ئەقڵ و گەمژه دێت

برۆ هەی حوشتر

حوکمه- بەزۆری، هەردەبێ

حوکمه دەبێ لەگەڵم بێی

حەپه کردن- زۆر قسه کردن

حەپەی دەکا

حەپه حەپ- هەرەشەو گورەشه

حەپه حەپ- یەکێ قسەی بکات و کەس گرنگی بەقسەی نەدات

حەپین- زۆر وەڕی

له حەپین کەوت

حەپس خانه- نەبوونی ئازادی له ماڵێك

حەتەم- بەمرۆی سەخی دەڵێن

نەوزاد حەتەمه

حاجی- له ڕووی ئیحترامەوه به مرۆڤی بەتەمەن دەڵێن

حەج- کاری چاك

حەج کردن- کاری چاك کردن

کارەکەت به حەجەکی هەبوو

حەرامکردن- ناخۆشیو هەرا دروست کردن

نانەکەی لێ حەرام کردین

حەرام زادە- فێڵبازو بەدفەڕ ، بێ وەفا

حەرام زادە دەرچوون- ناراستو فێڵباز دەرچوون لە کارێك بەرامبەر بە کەسێ

حەرام زادەیی- فێڵبازی ، بەدفەڕی

حەزیا- زاڵم، بێ داد

کەتمە زاری حەزیای

حەزیا- زۆر خۆر

ئەو حەزیایە بەمن تێر ناکرێت

حەقایەتی عەنتەری- کردارو کارێك زۆر درێژە بخایەنێت بەبێ سوود

حەساندنەوە- یارمەتی دانی یەکێك

نەوزاد باوکی حەساندەوە

حەسانەوە- هاریکاری کردن

حەس حەس- زۆر وەر، زۆر بڵێ

ئەو حەس حەسەی بێ دەنگ کەن

حەسیر مەیدان- دارکاری کردن

هەر ئێستە ئەنێرم میردە سەگبابەکەت بهێنن لەبەر چاوی خۆت حەسیر مەیدانی کەن

خازی- بلە- ل٥٣

حەسیرۆ- (١) خەسو (٢) خەزور

حەشر- هەراو هوریای تێکەڵو پێکەڵ

حەشر پێکردن- ئازاردان

حەشر کردن- هەوڵو کۆششو جەڵانەوەی زۆر بە چالاکانە ئەنجامدان

رۆژنامە ئەمڕۆ حەشر دەکا

حەڵقە بەگەش- هۆ، وەسیلە

حەفت روح- زیندەوەرێ کە درەنگ گیان بەدەستەوە بدا

حەفت رەنگ- بە مرۆی هەلپەرست دەڵێن، مەرایی کەر

مرۆی حەفت رەنگ زۆرە

حەفت‌و هەشت- بەردەق بەردەق، مشت‌و مڕ

ئەو ماڵە دەڵێی حەمامە

حەماموکی منداڵان- بە کاری بێ بنچینە دەڵێن

حەیای پیاز فرۆش- واتە بێ حەیا

حەیای کردە حەیای پیاز فرۆشی- واتە حەیای برد

حوج- مرۆڤی درێژی ناشیرین

حوشترو حەمام، حوشترو قەزازی، حوشترو هەڵپەڕین، حوشترو بلوێر لێدان- کەسێك کە شایانی کارێك نەبێت، کەسێك لە کارێك نەوەشێتەوە، یەکێ هیچ لە کارێك نەزانێت‌و کردبێتیە پیشەی خۆی

حوکمی قەرە قوش- سزادانی ناڕەوا، خەڵك بەناڕەوا بەگرت دان یان بەکوشت دان

حیزو دز- کەسانی بێ ئابڕوو بەدفەڕ

حەلال زادە- مرۆڤی راست گۆو بێ فرت‌و فێڵ

حەمام- شوێنی بەهەراو هوریا

حەمام- شوێنی زۆر گەرم

ژورەکە دەڵێی حەمامە

حەمامی ژنان- کۆڕی قسە کردن کە کەس ئاگای لە کەس نەبێ

حەواڵە بە گەواڵە- فریودان، تەفرەدان

حەواڵە بە گەواڵەمان پێ مەکە

حۆری - زۆر جوان

حووت- زۆر خۆر

حوتەو تێر نابێ

حیز– (١) بێ مانا، بێ جێ (٢) نارەوا ناراست

قسەی حیز دەکات نانی حیزی ناخۆم

حیز– ترسنۆك

حیزانە– هەموو شتێکی ناڕەوا قبول کردن

وەرامی سندان هەر قوزەقورتە

ژیانی حیزانە لە ژێر مردنە...

شەرەف ل٥٣٨

حیزانە– ترسنۆکانە

حیزانە لێیان دا

حیزاتی– ترسنۆکی

بە حیزاتی گرتیان

حیزە بخوێی– ژیانی خوێڕیانەو سەربار بوون

... بەڵام ئەو حیزە بخۆیو سەر شۆڕیەی بەدڵ نەبوو...

شەرەف ل٣٥٨

حیزی– (١) کاری نامەردانە کردن، شێوەی حیزان رەچاو کردن

ئاسۆ حیزی قبول ناکا

حیزی حیزان– لە ترسنۆك ترسنۆکتر

حیزی حیزان گاو– کەسێکی ترسنۆك لە یەکێ زۆر لە خۆی ترسنۆکتر بدات یا غەدری لێ بکات

## "د"

داباران– لەهەموو لاوە بۆ هاتن، لەهەموو لاوە خڕبوونەوە

هەر گوتم ترێ مشتەری داباران

دابەزین– کەم بوونەوەو هاتنە خوارەوەی نرخی کەل‌وپەل لە بازاڕدا

نرخی شەکر دابەزی

دابەزین– قسەی ناڕەوا بە یەکێ گوتن

دابەزیە سەری

دانەبا، بەبادان– بەفیڕۆ دان

دابەستە، دابەستی– تەمبەل‌و کارنەکەر

دابێژ دابێژ– کون بوونی لەش بەهۆی گولە لێدانەوە

هەموو لەشی دابێژ دابێژ بوو

داتەکاندن– هیچ تێدا نەهێشتن

داتەکین، لە بن هاتن– نابووت بوون، پارەو پول نەمان، لات بوون

ئەوەندەم لە منالەکەمان بەخت کرد داتەکیم

داخ بە جەرگەوە نان– زەرەرو زیان بەیەکێ گەیاندن، تووشی بەلا کردن

داخیان بەجەرگی‌وە نا

داربەسەر بەردەوە نەهێشتن– وێران کردن، خاپور کردن

داری توو پشتی من– چم لێ دەکەی حازرم

دارنان لە کونی زەنگەسورە– تورە کردنی مرۆڤی هارو هاج

داخ کردن، چزە لێدان– فریودان‌و زیان لێ دان، ئازاردان‌و زیان گەیاندن بە یەکێك لە ناکاوێکدا

داخ کراوم

داخ لەدڵ– توڕە لە رووداوی

دادۆش– کەسێ کە بەگزی دۆستەو بەهرە دەبا، بە فێڵ بوونە برادەر بۆ سوود وەرگرتن

دادۆشین– بەهرە بردنی ناڕەوای دۆستی گزی کار، داروتاندنی مەردوم بە ناخۆشیەك

داربۆ کردن– سزادان و تۆڵە لێ سەندنەوە، تۆڵە سەندن لە یەکێك

ئەوزاد دارێکی بۆ شاهۆ کرد

دار بەنێواندا هێنان– چارەسەرکردنی کێشەی نێوان دوو کەس

داربە نێوان داهێنان– پێك هێنانی دوو کەس،بەش کردنی بەبێ جیاوازی

داردەست– گزیر، خزمەت کار، ئەو کەسەی بۆ مەبەستی تایبەتی یەکی کار دەکات

مەبە دار دەستی پیاوی زاڵم

دارکە پێچان– کزو کەنەفت، لەڕو لاواز

دار لەدەو وەردان– شەرم نەهێشتن، رێزو حورمەت کەم کروتەوە

دارماڵ–دەفرێك کەلێوا و لێوبێ لە شتێکی ووشك، پڕاوپڕ،تەمام تژە

داروبار–هێزوتوان و لەش ساغی، بێ نەخۆشی

پیاوی بە داروبارە

داروبەر– هەمووشت

دارودەست، دارو دەستە، دارودەس، دەستوپێوەند– گزیر، خزمەت کار، نۆکەر

دارو گۆشت ئاشنایان نیە–لێدان وئازاردان کەس بەرگەی ناگرێت

داڕۆنی–یارمەتی دانی کەسێ

داڕۆنیان دەکەم

داری بێ بەر– ماندوو بوون وسودنەدیتن

خزمەتی داری بێ بەرمان کرد

دارتێ وەردان، چیلکە تێ وەردان– کارێك زۆرلێبکولیتەوەوزیاتر خەرابێت وتێك بچێ

دار لە دەم وەردان– بەرەلاکردنی کەسی و شەرم نەمان، بێ شەرم بوون

داری لە دەمی کورەکەی وەردایە

دار لەسەربەرد دانەنان– کارنەکردن بەهیچ جۆرێك

داری لەسەر بەردی دانانی

دارنابێتە ماشە– بەکارێك دەوترێت کەنەبێ بەهیچ جۆرێك

داری بریا– کاری رابردووی و لە دەست چوو

داری سەماوات– نارەحەتی کردنی زۆر، تەنگ پێ هەڵچنین، تەنگاو کردنی زۆر

بم بەیە داری سەماواتی نیمە

داژدار، داشدار– لاگرو پارێزەر، تەرەفدار

داش بە داش– زەرەر بەیەکێ گەیاندن کە زەرەری پێت گەیاندبێ، ووتن یا کردنی شتێك بەرامبەر بەشتێکی تر، تۆڵە سەندنەوە

داشۆریاگ– بێ شەرمو ئابڕو، بێ حایا، خوێڕی

داشی دامەی– هۆ، وەسیلە، بەکارهێنانی یەکێ بۆ مەبەستی تایبەتی خۆی

ئازاد بوە بە داشی دامەی

داعبا، دەعبا– مرۆی ناشیرینی نەقۆڵا

دەڵێی دەعبایە

داڤدوز– فێڵبازی زرنگ

داكو باب– زۆر خۆشەویست

داقەڵاشتن– تێ تەقاندن، هەڵاتنی بەپەلە

داك خۆگی– کەسێ دەگەی نامەردانەی هەبێ

داکوتان– مانەوەی کەسێك لە شوێنێك بۆ ماوەیەکی زۆر

لێرەیان داکوتایە

داکەوتن، داکەفتن– پیربوونو بەناوا چوانی گیاندار

داکوژان– برینەوەی شەڕو کێشە

داكە دزانە- سەر دەستەی دزان، ئەوەی ڕێ‌و شەێن بۆ دزان دادەنێ بۆ دزی کردن، دەلاڵی دز، هاوکاری نهێنی دز

داکە مارانە- ئاژاوە گێڕ، ئەوەی ئاژاوە دروست دەکات

داگرتی- بەفیز، بەدەعیە

داگیرسان- داهێزان‌و تا لێهاتنی جەستە، گەرم داهاتنی لەش لەتا

لەشم داگیرساوە

داگیرسان- ئاژاوە نانەوە، شەڕ دروست کردن

دامێن پیس، دامێن تەڕ، داوێن پیس- زیناکار، بەدفەڕ، ئەو مرۆیەی بە دوای ژنان دەگەڕێ بۆ مێ بازی

ئەو موعیزە پیاوێکی داوێن پیس‌و سەرخۆش‌و بێ فەڕو بەگەر بوو

شەرەف ل

دامێن گرتن، دامەن گرتن، داوێن گرتن، دەستەو داوێن گرتن- هانا بردن بۆ یەکێك، پەنا بۆ بردن‌و تکا کردن لە کەسێ

دامێن گرتن، دامەن گرتن- تووشی بەڵا بوون

ئەم بەڵایە دامێنی گرتووم

دامێنگیر، یەخە گیر- تووشی بەڵا بوون

دان بەجەرگی خۆدا هێنان- ئارام گرتن، بەپشی بەرامبەر بە ڕووداو

دان تیژ کردن- تەماح کردن

دان چوونە کلیلە- قسە نەکردن

دان لەزاردا نەبوون- فەقیرۆکەو نەزان

دان لێ سپی بوونەوە- شەرم نەمان

دانیان لێك سپی بویتەوە

دانەبا- هەلە خەرجی، ماڵ بەفیڕۆ چواندن، زیادە خەرج کردن

دانە بەر کلك، دانە بەر تڕان- کەم‌و کورتی دیتنەوە لە کەسێ، تیرو توانج تێ گرتن

دانه پشت گویّ– کەم تەرخەمی کردن بۆ راپەڕاندنی کارێك

دانه خۆره کردن– هەڵفریواندن، گرتن به گزیەوه

دانه خۆرەم کردیه هەتا دەگیریّ

دانه دوو– بوار پیّ دان

دانه دووی منداڵ باش نیه

دانه شاخ– یاخی بوون

دانشتن– وازهێنان له کارو بیّ لایەن بوون

ئازاد دانشتوه

داوێن گیر، دامەنگیر– تکاکار، ئەو کەسەی دەپارێتەوه

داو– گزوگەڕ، فێڵ بۆ گر تن

میر ده داوی کەوت

دوباز– گزیکار، فێڵ باز

دوباز دەداو ناکەوێت

داودۆز– فێڵ بازی که بەفێڵ نەگیرو بزانیت

داو کەفتن، کەوتنه ناو داو– توشی بەڵا بوون بەگزیەوه

داو لا دەر– فێڵباز

داو نانەوه– فێڵ نانەوه بۆ توشی بلا کردنی یەکێك

... کەوته دڵخورتیيەوەو لای وابو داوێکیان بۆ مێردەکەی ناوەتەوه

شەرەف ل ٩٢

دایەوه کەندی– زەرەرو زیان ویّ کەوتن

دایكو باوك– زۆر خۆشەویسته

فلسکیّ لەکن دایكو باوکه

دڕ– نەترسی بەدفەڕ، ئازای بیّ شەرم

ژنەکی دڕه، پیاوێکی دڕه

دڕان– بڵاوبوونەوه، ئاشکرابوونی باسێکی شاراوه

باسەكە دڕا
دڕان- مردنی بێ دینی بێ باوەڕ
هامان دڕا
دڕان- ئیرەیی پێ بردن و خەم خواردن
دڕان- زۆر خواردنی بێ فەڕ
هەتا دڕای نانت خوارد
دڕان- ئاشكرا بوون
دڕك، چقڵ- بە كەسێ دەڵێن كاری خەراپ ئەنجام بدات دژی مەردوم
ئەگەر گوڵ نیت دڕكیش مەبە
دڕك چاندن- كاری خراپە كردن لەگەڵ مرۆڤ
دڕك لە بن پێ دەرهێنان- ئازاردانی یەكێك
شەرت بێ بەڕێگایەكی وا ئەو دڕكەتان لە بن پێتان دەربهێنم
بۆره ل٣٦
دڕكی لە دەم دایە- ئەو كەسەی قسەی خەراپ لە مسەلەیەك دەكات، قسەی خراپ
دڕكی مەم و زینان- شوفاریو شەیتانی كەر دژی دۆست
پیرۆت گوتی: یارە من هەرگیز نابمە دڕكی مەم و زینان
گەدا- ل٨٦
درشت- مرۆی قەبەی تێ نەگەیشتو
درێژ داهۆڵ- مرۆی تەژەی لاواز
دڕندە- زۆردار، زاڵم
دزنەبەر- دزنەخۆر، شتی بێ نرخ
دڵ- زۆر خۆشەویست
دڵەكەم چۆنی
دڵ- ناوەڕاست و ناخ

کەرکوك دڵی کوردستان

دڵاوا– سەخاوەت، بەخشندە، دژی رژدو چروك

هەباس ئاغا لە زەویەکەیدا باغی ناشتوە زۆریش پیاوێکی دڵاوا بوە

شەرەف ل٦٠٥

دڵ ئاسن– دڵ رەق، دڵ بەرد

سەربازی تورکی دڵ ئاسن

شەیدای بۆ خوێناوی ڕشتن

کامەران موکری ل١٨٥

دڵ ئاو خواردنەوە– خاتەر جەم بوون، بێ خەم بوون، گومان نەمان

بە قسەکانت دڵم ئاوی خواردەوە

دڵ ئاو دان، دڵاڤدان– شادومان کردن

دڵ ئاوەدان ، دڵاوەدان– مرۆی وریاو زۆرزان

دلاوەر– ئازا، رەشید، گەڕناس، بوێر، عگید

"... گوریسیان دەلێواری بورجان ترینجاندو دلاوەرانی زەرقی بە پەیژەدا چونە بان..."

شەرەف ل٤٤٩

دڵ ئێشان– عاجز بوون، توڕە بوون

"... منداڵو وردەشیان هەموو کوشتن، خەڵکی ئێران بەو کارەساتە زۆر دڵیان ئێشاو..."

شەرەف ل٢٢٧

دڵ بردن– عاشق بوون

دڵی بردم کچێکی چاردە ساڵە

دڵبرین، دڵ بریندار– زۆر غەمبار

ئەمجارە با بێنە سەر باسی ئەو ئەویندارە دڵ بریندارە بەناو دەنگەی

شەرەف ل٣٥

دڵ بریان، دڵ بریندار، دڵسوتاو، دڵ ریش- خەفەت بار، توشی بەڵا هاتوو
دڵبێش- بێزار ، وەرس
دلبەر-گراوی، ماشقە، خۆشەویستێك كە دڵت راكێشێ بۆ خۆی
ئەو نامەیەم لەبۆ بەرە          بیدەرە دەست ئەو دلبەرە
فۆلكلۆر
دلبەند، دڵبەستە- گراوی، ماشقە
دڵبەندی عەشقی ئەو بەڵك چاوەم
بێ كەس
دڵبەرد، دڵ رەق، دڵ سەخت- بێ بەزەیی، ركۆنی
گلەیی‌یان بوو لەدەست چلیسی‌و تەمەعكاری سووخۆرو دڵ سەختی خاوەن ملك
كوێرەوەری ل٥٧
دڵ بەر دەست نەدان- ئاسوودە نەبوون
دڵ بەژان- خەمبار
بە بیرمادێ بەسەر هاتی ژیانم هەڵێك دڵخۆش‌و سەدجار دڵ بەژانم
شەرەف ل٧٧٦
دڵپاك، دڵ پاقژ، دڵخاوێن، دڵڕاست- بێ گزی، بێ فڕوفێڵ، بێ عەیب‌و باش بەرامبەر بە خەڵك
لە زانایانی پیاو چاك‌و دڵپاك‌و بەوەج دەپارێمەوە
شەرەف ل١٤
دڵپڕ، دڵ تەژی، دڵ توند- خەمبار، بێزار، وەرس
لێرەدا گێلە بەچەشنێك دڵی پڕ بوو كە نەیتوانی درێژە بە قسەكانی بدات.
گێلە ل٣٢
دڵپڕ خوێن- زۆر خەمگین
دڵپتەو، دڵ قایم- ئازا، بوێر، نەترس

دڵ تاریك– كەسێ بێ هیوا بێت لەكارو كردەوەیەك

دڵ ڕاگرتن– زۆر حورمەتو ڕێز گرتن

دڵ داكەتن– ئاسوودە بوون لە ئەنجامی كارێك

دڵ پێ سووتان– بەزەیی هاتنەوە بە گیاندارێكا

دێزە دڵی پێ سووتاو بە خۆی نەوەستاو لە گەڵی دەستی بە گریان كرد

بۆرە ل٣٩

دڵ پیس– دڵ باش نەبوون لەگەڵ مەردوم، بیر خەراپ، بیرو هزر خەراپ، بەگومان لە ژن

دڵ پیسكردن– گومان پەیا كردن دەربارەی یەكێك

دڵتەنگ، دڵ پەشێو– خەمبار ، غەمگین، نیگاران

دڵ خۆش، شادمان

بەدەماغو بە دڵی خۆشو چاوی ڕونەوە ژیان بەڕێوە دەبەن

شەرەف ل١٣

دڵ خار، دڵ چەپەڵ، دڵ گەمار– بیرو هزر خەراپ

دڵخون، دڵ بەسۆ، دڵ بەخون، دڵ خوێن– زۆر غەمگین، گرفتار بوون بە كارێكی ناخۆش

باوكی ئەمانەی فەرموو فەرەیدون

سەری خۆی داخست سەرسامو دڵخون

مەدهۆش ل٥

دڵخور، دڵخورد، دڵ پەریشان– نیگەران

دڵخۆش، دڵشاد، دلشا، دڵڕوون– بە كەیف، دەماخ چاخ، شاد

دڵخۆشم كە دەتبینم

دڵدار، دڵداگ– ئەویندار، عاشق

دڵداری ئەفسانەیە   هەرچی ئەڵێی وانیە

دڵدانەوە– هێور كردنەوەی كەس تورە بوبێ بەقسەی خۆش

دڵرفێن، دلبەر– گراوی، ماشقە– یارم

ئەمشەو تا سبەی لەیارم مەکە

بێ ماڵ ئاوایی دڵدارم مەکە

مەدهۆش ل٥

دڵ روناك– ئەو کەسەی بە هیوا دەژیت

دڵ رەشکردن– لەبەر چاو خستن

دڵڕەش، دڵ رەق– بێ بەزەیی، زاڵم، زۆرکار، زۆردار، کینەدار، رکۆنی، مردومی بێ باکی نامیهرەبان

"... خەریك بوو بەگژ ئەو پیاوە دڵڕەشەدا بێم..."

هێمن ل٣٥

دڵرەنج، دڵ شکاو– زویر کراو، ئازاردراو، نارازی کراو

دڵرەنجان، دڵ ئێشان– عاجز بوون، توڕە بوون، زویر بوون

دەڵێن جارێك مەولانا ئەبو بەکر دڵی لە بەدر بەگ رەنجاوەو لێ بڕاوە کە لە جزیرە بروا

شەرەف ل٢٩٢

دڵرەنجاندن، دڵ ئێشاندن، دڵ شکاندن، دڵشێلان– عادز کردن، زویر کردن

دڵسارد، دڵسار– ناهومێد، بێ مەیل، کەسێك لە کارێکدا گومانی پەیدا کردبێ و گەرم و گوڕ نەبێ

دڵساردی – ناهومێدی

کەس ئاوڕێکی بە خێری لێ نەدایەوە سەری ناهومێدی نایەوەو بە دڵساردی ڕوی کردە تەوریز

شەرەف ل٤٠

دڵساربوونەوە– ناهومێدو ڕاڕابوون لە کارێکدا

دڵسارد کردنەوە– ڕاڕاکردنی یەکێك لە کارێکدا

دڵساردی– ناهومێدی، ڕاڕایی لە کارێکدا

دڵساف، دڵپاك– بێ فێڵ، ڕکۆنی نا، بێ گزی
"... چەندی بڵێی باش‌و دڵساف‌و خاوەن ویژدانە..."
بۆرە ل١١
دڵ ستور، دڵ گەورە، دڵ قایم– ئازا، ڕەشید، عگید
دڵ سوتاو– بەزە ، بەڕەحم
دڵم بۆ داکت دەسوتێ
دڵسۆز– خەمخۆر، کەسێك کە میهرەبان بێ بەرامبەرت
دڵسۆزم بۆ گەل‌و نیشتمانم
دڵشاد، دڵشا– بەکەیف، دەماخ جاخ
دڵشادم کە دەدبینم
دڵشکاو، دڵشکای– ڕەنجاو، زویر بوو
دڵشێر– ئازا، ڕەشید، بوێر، نەترس
دڵفراوان، دڵ گەورە، دڵ فرە– بەسەبرو حەوسەلە ، بەپشو، هێمن‌و لەسەرخۆ
دڵ کرانەوە– گوشادی دڵ بەهۆی هەر شتێکەوە بێ، کەیف خۆش بوون
بە دیتنت دڵم کرایەوە
دڵ کرمن، دڵ کرمۆل، دڵ کرمی، دڵ پیس– بەگومان بوون لە کردەو کارێك، بەدگومانی لە شتێك
دڵ کرمی– بەگومان
دڵ کرمی بوون– گومان پەیداکردن
دڵ کرمی کردن– گومان لێ پەیدا کردن
دڵ کولاندنەوە– غەم‌و خەفەت وەبیر هێنانەوە
دڵ لەت لەت– غەمبارو خەمگین
دڵ مەند کردن– عاجز کردن
لەهەموو تەمەنی‌دا کەسی بە خۆڕایی دڵمەند نەکردوە....
شەرەف ل٢٧٩

دڵ گران– ڕەنجاو، عاجز، عیدن، کەسێکی زویر لە کردەو کارێك

دڵ گرانی– زویری

بە دڵ گرانی وەلامی دامەوە

دڵ گەرم– بەهومێد، هیوادار، کەسێك کە لە کارێکدا بە چالاکی کاربکات، رشت لەسەر کار

دڵ گەورە– بەپشی، پشی درێژ

دڵ لە دڵ دان– دوو دڵی، ناخاتر جەمی، دوو دڵیو گومان لە کارێك

دڵ لە دوڕدەست، دڵ لەناو مست، دڵ لەمشت، دڵ لە مست، دڵ لە دەست– قەوارەی مەترسی کەلەبەر چاوبێت یان بەرپا بێتو زیانێك بەکەسێ بگەیەنێت

دڵ لەسەر دەست– زۆر ترسان

لە ترسی دەعباو دڕندان دڵمان لەسەر دەستمانە

بۆرە ل١٧

دڵ مردوو– دڵ مردگ– دڵ مردە– دڵ مری– مرۆی سیسەڵەی ژاکاو، کەسێك کە ئارەزوی شتی خۆشو جوانی نەبێ

دڵمەند، دڵمەن– دڵئێشاو– بە گلەیی، عادز، بێزار

گوتم ئەی بلبلی خەمگینی دڵمەند

مەنالێنە لە دەس داو لە دەس بەند

تاریك روون ل١١٣

دڵنیا– ئاسوودە، خاترجەم، بێخەم

مزیر دڵنیابوو کە هێشتا نرخی لایان ماوە

بۆرە ل٤٩

دڵنیایی– خاتر جەمی، بێ خەمی

دڵ نەوایی– ئاشت کردنەوەی دڵی ییکێك کە زویر بووبێ

دڵ نەرم، دلۆڤان– خاوەن ویژدان

ئەو کابرایەی کە ئەرکی سەربڕینی لاوانی پێ سپێراوە پیاوێکی دڵنەرمو خاوەن بەزەیی و بەئاکارە

شەرەف ل٢٢٧

دنیا دیتن- خاوەن ئەزموون، زیرەك و لێزان لە کاروباری ژیان

دنیا قونە کەو کردن- بەرەو پیری چوون

دنیا خواردن- خەڵك هەراسان کردن

دۆخین توند- مەرد، چڕدۆخین

دۆخین بەحەرامی کرانەوە- رابواردن لەگەڵ ژنان

دۆخین پساندن- بەزۆری ئیلاقە کردن

دۆخین بەزین- شەرمەزار بوون

دۆخین شل- بە ژنی سۆزانی دەڵێن

دڵ وریا- مەردومی هوشیارو لێزان لە ژیان

دڵە راوکێ، دوودڵی- نیگەرانی، پاڕایی لە کارێکدا

دڵەکەم- ئازیزەکەم، خۆشەویستەکەم

دڵە لەرزە- ترسانی زۆر

دلێر- پاڵەوان، ئازا، رەشید

ئەی دلێران بێچوە شێران بەسیە هەڵسن لەخەو وا بەیانە

دمبك چی- خوێڕی و بێ ئابڕو

دوبەرد- بەردی ناو گۆڕ

هەتا لەنێو دوو بەردانم دەنێن لەبیرم ناچێ

دوو بەڕوو بارکی کەرێ- بەکارێك دەوترێت بە هیچ جۆرێك نەبێت

دوپشك- مرۆی زیاندار، ئەو کەسەی زیان بەخەڵك دەگەیەنێ

دودڵ- ناخاتر جەم، کەسێك لە وتنی یا کردنی کارێك پاڕابێ، ئەو کەسەی نەتوانێ زو بڕیار بدات ،قەرار بدات جارەك بڵێ ئاو جارەك بڵێ نا

دودەست بەناڵە- سەودا گەری بێ دەست مایە، بەیەکێك دەڵێن بەکرینو

فرۆتنی شتی هیچ وپوچ دەست مایەکی باش
پێکەوە بێنێ دەست بکابە کرینو فرۆتنی شتی گەورەتر
دوربین- بنیادەمی زرنگ و تەکۆز، ئەو کەسەی عاقلانە لەدوارۆژدەروانی
دورە پەرێز- بێدەخل، بێلایەن، خۆ لەخەڵك پارێز، خۆ دەکار نەگەیاندن
جا چونکە بۆ بارەبارو کاروباران لەباژێران دورەپەرێز بوون و
رویان نەدەکردە شاران
شەرەف ل٢٨
دورناس- ژیرەو زیرەكو لێزان و شارەزا لە کارێك
•••چیرۆك زانانی دورناس و مێژو نوسانی تەردەست•••
شەرەف ل١٢٤
دوروو، دورەنگ- کەسێك لەروو جۆرێك لەپاش ملە جۆرێکی تربی
دووقون لە شەرواڵەکی- دووکەس زۆر برادەر
دوورکوژ- لەدور جوانی لەنزیك ناحەز، شتێك لە لەدورەوەجوان ئەنوێنێ
لەنزیکەوە وانابێ
دور کوژی نزیك خەسار
دوزبان، دوزوان، دوزمان- دنەدەری کێشە بە قسە، ئاژاوە دروست کردن
هەربەقسە لەنێوان دوکەس یازیاتر
ئاسۆ دوزمانە
دوزمانی- قسەهێنان و بردنی بەد فەرانە
دوزمانی مەکە، دوزمانی باش نیە
دۆزەخ- بەژیانێکی ناخۆش دەڵێن، نەبونی ئاسودەی
((•••بۆ ماڵ ئەکەین بەدۆزەخ دڵنیابە دڵسۆزتم•••))
سەرچاوە ل٩١
دوسەر- ناراست و لەروو جۆرێکی تر دوقوزو دوقون
دۆڵپا- دەس هەڵنەگری چەل ومل

وەك دوڵپا سواری شانم بوە دەسم لیٚ هەڵناگری

دۆم– فێڵبازی بێشەخسیەت

دەبە– ئاژەڵی زگ پڕ

دەبەرکەوتن– ناورانەوەلە کەسی، پاڕانەوە تکالێکردن

چەندی دەبەرکەوتم نەگەڕاوە

دەرخۆنە لەسەردانان– باسێك یان نهێنیەك کەباس نەکرێت و تەپس بکرێت

دەرمان– شتێك کەم بێت دەست نەکەوێت

دەرون ڕیش، دەرون بریندار، دەرون زامار– دوچاربوون بەغەم وخەفەت، بەڵا بەسەر هاتگ

دەرد دەرمان کردن– چارەسەرکردنی کێشەی کەسیٚ

دەرد دەرمان کەر– چارەسەر کەر

دەراو– سەرەتای پەیدابوونی کارێك

دەرد– هەوڵو ڕەنجدانی زۆر

بەهەزار دەرد هەتا لێم سەند

دەرد– ماندو کردنی زۆر ،زەحمەت دان

زۆری دەرد داینیٚ

دەردە سەری– ئەرکی زۆر، زەحمەت، ڕەنج وماندو بوون

توشی دەردەسەری بووم

دەرك ودوکان– دەزگای دەوڵەت

خوا دەرگ و دوکانت داخات

دەرۆزەکەر– هەبوی ڕەزیل، رژد

دەروێش– یەکی کەبەهیچ جۆرێك لە قسەت دەرنەچیٚ

دەرلنگ دڕاو، دەلینگ دڕاو– هەژارو شڕول، بیٚنەوا

دەس– دەست– تواناو هێز

دەسی هەیە– دەستی هەیە– توانای هەیە

دەساودەس– دەستاو دەست، دەستی دەستی– تەفرە

دەساو دەسم پێ مەکە

دەست ئاوێژ– هەڵمەت

ئازاد دەست ئاوێژ بووە

دەست بار لەگەل گرتن– یارمەتی دانی کەسێ

دەس باد، دەست بڵاو– ئەو کەسەی ماڵ بەفیڕۆ دەدات بەبێ سوود

دەست بان دەس– باڵا دەست تر– گەورەتر، بەهێزتر لە پلەو پایەدا

دەسبڕ– دەزبڕ– گزیکار، فریودەر، خاپینۆك، فێڵبازی مەردوم خەڵەتێن

" چون دەگاتە دەستی دەسبڕ ئەو هەموو توتنە"

تاریك روون– ل٧١

دەس بڕی، دەست بڕی– گزیکاری ، فریودانی خەڵك، ئەو کەسەی فێڵ لە خەڵك دەکات

دەس بەدەمی شێرا کردن– کارو کردەوەی ئازایانە ئەنجامدان

دەست ئەستور– زۆردار ، زاڵم

ئەوڕۆ دەست ئەستورە

ئەوڕۆ ئاغایە

دەست بادان، زۆر لێ کردن– غەدر لێ کردن

دەست باڵا– خاوەن دەسەڵات

لە بەسامی و سەربەرزیدا لە گشتیان دەست باڵاترە... شەرەف ل٦٢١

دەست بەئەژنۆ، دەستەو ئەژنۆ– غەمبار، مات، لێقەوماو

هەرچی دەی بینی دەست بە ئەژنۆیە

لەهەموو لاوە شین و ڕۆڕۆیە

تاریك روون– ل١٤٠

دەست بەتاڵ– مەردومی بێ کار، کەسێك بێ ئیش بێت

ماوەیەکە دەست بەتاڵم

دەست بە خوێن سور کردن، دەست خوێناوی کردن– مەردوم کوشتن بە ناڕەوایی

( دەست بەدەست دان، دەست لەدەست دان، پەنجە کرۆشتن)– پەشیمانیو دەرچونی هەلێك لە دەست

دەست بەردار، دەزبەردار – وازهێن کەسێك کە دەستی لەکارێك هەڵگرتبێ

دەست بەڕووەوە نان– جوابدان و ناهومێد کردنی یەکێك کەداوای شتێکت لێ بکا، ناهومێد کردنی یەکێك

دەست بەزاخا کردن، دەست بەزاخاوا کردن– فریودانو زیان پێ گەیاندن، فێڵ لێ کردنو هەڵخەڵەتاندنی یەکێك، فریودانو زیان لێدان

دەست بەسەرا کێشان، دەست بەسەردا هێنان– دڵدانەوەو یارمەتی دان

دەست بەسەر– ژێر چاودێری پۆلیس

" سەردەمێك ئاوارە بووم ماوەیەکیش دەست بەسەر"

تاریك روون– ل١١٥

دەست بەسینە، دەست لەسەر سینگ– ئامادەیی نیشان دان بۆ ئەنجامدانی کارێك

دەست بەستن– فێڵ لێ کردن

دەست بەستە– مرۆی فێڵبازو ساختەچی

دەست بەسەردا شکان– دەرقەت هاتن، پێ وێران

دەست بەسەر ا گرتن– داگیرکردنی شوێنێك، زەوت کردنی شتێك

دەست بە کوتەك، دەست وەکوتەك– مەردومی توڕەو شەڕانی

دەست پاك– ئەمین، راست لە ماملەدا

دەست پان کردنە– دەروزە کردن، سواڵ کردن

گرنگ ئەوەیە لە ڕێگایەکی شەریفانەوە خۆ ئەژێنم، دەست لەکەس پان ناکەمەوە..."

ژانێکی خامۆش ٣٤

دەست پێداهێنان- هەموو شتێك بردن

ماڵەکەی دەستەکی پێ داهێنا و هەمووی برد

دەست پیس- مەردومی گەندە، دزی ناومالْ، دزی خوێرلە

دەست پیس کردن- کوشتنی پیاوی نائەمین و بەدفەڕ

دەست پڕ- دەوڵەمەند، خاوەن پارەوپول

دەست پیوە گرتن - بەفیرۆ نەدان

دەستە خستنە خوینی‌یە ك-یەکتری کوشتن

دەست دەدا -دەبی، ئەبی

دەست پێوەنان - دەرکردن ، لەکۆل خۆکردنەوە

دەستەکم پیوەناودەرم کرد

دەست پێوەنە سووتان - بە خۆرایی و بی ماندوبوون سودوقازانج لە کاریك دەیتن

دەست تەنك - دەست تەنگ - کەم دەست - فەقیر ، هەژار ، تەواو

" دلسەختی و خوانەناسی خاوەن ملك ، برسیتی و رووتی و دەست تەنگی و بی دەرامەتی خۆیان - کوێرەوەری - ل٥٧

دەست تەنکی - دەست تەنگی -هەژاری ، نەداری ، نەبونی

دەست تێدابوون - بەشداربوونی کەسێ لە کارێ

دەست دان- لوان، مومکین بوون

دەست دان- تەسلیم بوون بە دوژمن

تا نەکوژران دەستیان نەدا

دەست دار- مەردومی دەوڵەمەندی خاوەن توانا

دەست درێژ- زۆرداری، ستەم گەر

دەست درێژی- زۆرداری، ستەم گەری

دەست درێژی کردن- زۆرداری کردن

دەست درێژی بۆ مالْ و ناموسی ژێر دەستان کردن٠٠٠ گیلە ل١٠

دەست ڕاكرن، دەست كردنەوە،دەست هەڵهێنان- بەگژ دوژمن داچون، لە دوژمن دان

ڕۆڵە دەی دەست هەڵێنە

پەردەی ترس بدڕێنە

بزن و گورگ ل٣٨

دەست ڕۆیشتن- توانا بوون بۆ ئەنجامدانی كارو كردەوەیەك

گەلێكی لەسەر دڵ گران دەهات و زۆری لێ تورەبو بەلاًم كەمی دەست دەرۆیشت

شەرەف ل٢٧

دەست ڕەش- كەسێك كە هەر شتێكی لێ وە دەست كەوی سوودی

لێ نەبینریٚ، كەسێ خێری لەدەستی نەبینێ زەرەری هەبێ

كوڕی خۆم تۆ نەت دیون و نایان ناسی، زۆر خراپن، زۆر پیاوكوژن و بێ بەزەیی ودەست ڕشن،تاریك ڕوون ل١٨

دەست زراو- بێ هێزوتوانا

دەست سارد- فیره كارنەبوو، كەسێ لە كاركردن ئازانەبێ

دەست ساردبوونەوە- پەشیمان بوونەوە لەكاری ناوەوا ئەنجامدان لەكات وساتی تورەبوون

دەست سپی- یەكی پیشەیەكی وا نەزانیٚ خۆی پێ بژیێنێ، كارنەزان

فێره كار نەبوگ

دەست سپی كردن- پارەدان بەكەسێ

دەست سووك، دەست شڤك- كەسێ كە دەس بە هەر كارێ بكا و زووتەواو بێ

دەست شاش،دەست باد-دەست بڵاو- دەست شڕ- دەست والاً- ماڵ بە فیڕۆدەر ئەوكەسەیماڵ پارەوپول بەفیڕۆدەدات

دەسشكێن- لەخشتەبەر، فریودەر

دەست قووچان- ڕژدیو چروكی، لەچەری

دەست قوچاندن– ڕژدبوون، ڕەزیل بوون

دەست قوچاو– ڕژد، لەچەر

دەست قورس– دەست گران– تەمبەڵ لە کارکردن

دەست کراوە، دەست ڤەکری، دەست والا، دەست ڤالا– سەخاوەت، بەخشندە، دژی رژدو چروك

دەست کورت کردن– کەم کردنەوەی تواناو هێزی کەسێ

وردە وردە پێی بەسوخاربی غەنمی خۆی هەلکیشاوەو دەستی کورت کردوە...

شەرەف ل٨٤

دەست لە پنچك گیر بوون– کەسێ کە دەگاتە سەرتای مەبەست

دەست لە پنچك گیر نەبوون– بەهیچ جۆرێ نەگەیشتنە سەرتای مەبەست پاش هەوڵ و تەقەلای زۆر

دەست لەخۆ بەردان– ئومێد بەخۆ نەبوون

دەست لەخۆ شوشتن– کات و ساتی تەنگانە کە مرۆڤ ڕووبەڕووی مردن دەبێتەوە

دەست لێ هەڵنەگرتن– واز لێنەهێنان

دەست لەهەموو کونەکی نان– لەکاری خەتەر نزیك بوونەوە

دەست لە خوێن شۆرین– تۆڵە نەکردنەوە

دەست کورت، دەست تەنگ، ماڵکەتی، دەولەت کەتی– بێ پول و پارە، هەژار

خەڵك زۆری دەست کورتە

دەست کردنەوە، دەست هەڵێنان– بەرگری لەخۆکردن و لەدوژمن دان لەکاتی شەڕو ئاژاوەدا

دەست کەلا– مرۆی خۆڕە پێش خەر

دەست کێش– ڕێ نیشان دەر، ڕێ بین

دەست کێشانەوە– واز هێنان لە کار

دەست گیر کردن- گرتن بەگزیەوە

دەست گوشاد- سەخی، بەخشندە

لەراست هەژاران و بێچاران زۆر دەست گوشادو دڵاوابووە بۆ داماوان و لێ قەوماوان...

شەرەف ل٤٥

دەست گیرۆیی- یاریدەی ماڵی- یارمەتی دانی یەکێك بەشت پێ دانی

دەست لە بانی دەست- کەسی بەهێزتر لە بەهێز

دەست لەبانی دەست زۆرە

دەست لەپشت دان- دنەدان- هاندان، یەکی هانی یەکێ بدات بۆ ئەنجامدانی کارێك

دەست لە دەست- تەبایی هاوکاری یەکتری

دەست لەدەست قوەت لە خوا

دەست لەسەر چاو، دەست لەبان چاو- ئامادەیی نیشاندان بۆ جێبەجێ کردنی کارێك

بەدڵسۆزی هەمیشە دەست لەبان چاوو دەستەونەزەر هەڵوێستابوو...

شەرەف ل٦٩٥

دەست لەسەر خەنجەر- سازو ئامادە بۆ شەڕ

دەست لێ سەندن- بەسەردا زاڵ بوون

دەست نەکردنەوە- کەسێك ترسنۆك بێت و بەرگری لەخۆی نەکات

دەست نەگرتن- یارمەتی نەدان و کۆمەك نەکردن

دەست و دڵ رەش- زیان بەخش، زۆرکار، زۆردار

ئەفراسیاب پیاوێکی دەست و دڵ رەش و روکەش و زۆرکارو زۆردارو بێ بەزەیی و خوێن ڕێژ

شەرەف ل٧٤

دەست و دڵپاك- مرۆڤی بێ زیان و میهرەبان

نەسرەت الدین پیاوێکی دەستو دڵ پاکو ئاکار چاکو گەل دوست بوو

شەرەف ل٧٧

دەست لەناو دەست- تەبا، کۆك، رێك، یەکگرتوو

دەست لێ شوشتن- ئومێد پێ نەمان

دەست لێك بەردان- واز لە یەکتر هێنان، جودا بوونەوەی دوو کەس بەیەکجاری

حەز لێ کردن گەلەك خۆشە بەڵام دەست لێك بەردان دەردەکی گرانە

حەیرانی- کوردی- گۆرانی

دەست لێ وەشاندن- شێت کردنی مرۆ بە دەست جنۆکە، عەقڵ تێك چوون

کابرا عەیبی نەبوو دەستیان لێ وەشاند

دەست نادا- (١) نابێ، گەرەك نیە، (٢) تەسلیم نابێ

دەستندەخۆر- کەسێ کە چاو لەدەست بێو نانی بەمنەت بخوا

دەست نێژ- خزمەت کاری خۆشەویست

دەست نوێژ گران بوون- کاتو ساتی مرۆڤ کاری سەرئاوی هەبێ

دەستوبرد- خێرایی لە فەرمانو کارا، چالاکی

دەستوبرد کەن با برۆین

دەستوپێ، دەستو پێوەند- ئەو کەسانەی کەلەژێر دەستتا کارت بۆ دەکەن، کۆمەڵی خزمەت کارانو نۆکەران

.... لە هەرکوێ دەستو پێوەندی میر عەزیز بدیتایە...

شەرەف ل٣٠٦

دەستو پێ سپی- کار لەدەست نەهاتوو، هیچ نەزان، کارنەزان

بەڵام من بە پێچەوانەی هەموو کورەکان لەو بەشەدا دەستو پێ سپی بوم

گێلە ل١٠

دەستو پێ ون کردن، دەستو پێ بزرکردن- شلەژان

دەستو دو- هێزو توانا

له دهستو دو كهوتوه

دهستو دهم كردنه يهك- راو تهگبير كردنه يهك

دهستهو ئهژنۆ- بێ كار دانيشتنو ناهومێد بوون

لهپاش سى ساڵ ناهومێدىو دهستهو ئهژنۆيىو گردهنشينى دهرفهت هاتهوه...

شهرهف ل٢٨٥

دهس دهبن بالهوه گرتن- يارمهتى دانو بههاناوه هاتن

دهست وشك بوون- قسهيهك يا بينينى شتێك دهست له جوڵه بخات

دهستو مست- كار بهدهستى خۆكردن، خۆت كارى خۆت مهيسهر بكهيت

ئهوهى پياو بهدهستو مستى خۆى نهيكا بهكار نايه

دهست يار- يارمهتى دهر

دهستهبهر- كارێك يان كردهوهيهك خستنه ئهستۆى خۆت، زامن، كهسێك كه بهڵێنى به شتێك دابێ

دهسته بهر بوون- دهسته بهرى- له ملهخۆ گرتن، بهرعوده بوون، بهڵێن دان بهكردنى كارێك

لهمهولا بهرانبهر بهو بڕيارهى كه دهسته بهرى بوم دهست دهكهم به درێژه پێ دانى...

شهرهف ل٣٩

دهسته پاچه- كلۆڵ، پهرێشان

دهسته دز- دايكه دزانه- ئهوهى پلان بۆ دزى كردن دادهنێت بۆ چهند دزێك

دهسته راست- باوهڕ پێ كراو، جێ باوهڕ

مهلێك كاميل له رۆژگارى باوكى ببوه دهستى راستى بابىو ...

شهرهف ل١٧٩

دهسته شكاو- ماڵ وێران، فريو خواردو، كهڕهواله، كۆڵهوار

دهسته شكێن- فريوخواردو، ئهو كهسهى فێڵى لێ كراوه

دەستە شكێن كردن– فێڵ لێ كردن

دەستەڵات، دەست ڕۆیشتو– توانا، كار ئەنجام دان

دەستەڵاتم نیە

دەستەو داوێن بوون– پاڕانەوە– لالانەوە– تكا كردن

دەستە وەستان– نەزان و ڕەشۆكی

خالید پاشا پیاوێكی دەستە وەستان و بێ مشور بوو

شەرەف ل٢٢٨

دەستەو یەخە– شەڕ لە نێزیكەوەو رووبەروو

دەستەو یەخە لێكیان دا

دەستی خۆم بۆن نەكردیە– هەستم پێ نەكردیە

دەستی شەوی نەبوو– شەو توانای نەبوو

دەستی دەستی– دەسی دەسی– تەفرەدان، هەڵخەڵەتاندن، هەڵفریواندن

دەستی دەستیم پێ مەكە

دەفتەری كۆن خوێندنەوە– شتی كۆن هێنانەوە یاد

دەڤ بەردا، زار شڕ– دەم دڕاو، دەو دڕای– تێدا نەوەستاو، ئەو كەسەی نهێنی یا قسەیەكی لەلا گیرنابێ و ناوەستێ ئاشكرای دەكات

دەمار– غیرەت، پیاوەتی

زەلامەكی بێ دەمارە

دەمار زل– بەفیز، لەخۆ بایی

لەم سەر رەقی و دەماری زلیان بێگانە دەبن سواری ملیان

شەرەف ل٣٦

دەم بونە تاقی چرا– دەم بوونە تەڵەی تەقیو– بەیەكێك ئەوترێ كە لە شتێكی كوتوپڕییەوە واق وڕمابێ و قسەی پێ نەكرێ

دەم بەردان– زۆر وەڕی كردن، زۆر وتن، زۆر ڕەو

دەم پیس– دەم چەپەڵ، دەو پیس– مردومی جنێودەر، ئەو کەسەی زۆر جونان دەدات

پیاو ماقوڵانی ئەو ناوە کەلەبەر دەست‌و دەمی پیسی شەمس الدین وەتەنگ هاتبوون

شەرەف ل٣٩٢

دەم تاڵ– قسە رەق، بەدسکوت لەکاتی قسە کردنا، راوێژ ناخۆش

دەم تەڕ– بەیەکێ دەڵێن کە هەر بەدەم پیاوەتی بکا، بەڵێن دەری بە خۆڕایی، کەسێ بەقسە پیاو فریو بدات

دەم تەڕ کەرەوە– میوەو هەرچی دەم تەڕکا، میوەو تەڕەکاری

دەم تێ ژەندن– خەرجی زیاد کردن لەدارایی

دەم تەور– کەسێ پاش ملە قسەی خەراپ بکات

دەم چونە کلیلە– بەسترانی دەمو نەکرانەوە لە ترسانا، زار رەق بوون، قسە بۆ نەهاتن

دەم چەفت، دەم چەوت– بەیەکێ فەقیرۆکە دەڵێن، قسە نەزان

دەم داچەقاندن– مردن

دەم داچەقاو– مردو

دەم درێژ– چەنە باز، چەقە سرۆ، زۆر وەڕ

دەمراس، دەمراست، دەوراست– (١) مەردومی قسەزان‌و فەرمان رەوا

(٢) نوێنەری خەڵکی بۆ قسەکردن

دەمراس بوونەوە، دەمراست بوونەوە– دەوڵەمەند بوون‌و تێر خواردنی یەکێك لەپاش برسێتی‌و هەژاری، دوای هەژار بوون دەوڵەمەند بوونەوە

دەمڕوت، دەوڕوت– پیاوی مناڵکاری بێ نموود کە شەرمی لێ نەکرێ

کورەکەی دیکەی کە ناوی عەلی بەگ بو هێشتا هەر لاوێکی دەمروت بو کە مردن کردیە قەرەبوو...

شەرەف ل٣٨٨

دەم ڕەش- یەکێك هەر نوقلانەی خەراپ لێ بداو شووم بێ، کەسێ کە شتی چاك نەبێژێ

دەمڕێژ- کەسێ قسەی لەسەر یەك دەکات

دەم سوتان- قسەی باسی کەسێ پێ ناخۆش بێت

... کە چوین ئاسکۆل لەوێ نەبوو دەمم سووتا هەواڵم پرسی...

بلە ژان ل٦٧

دەم سارد- قسە نەزان، گێلۆکە

دەم سپی- پیاوی قسە ڕەوا کە شەرمی لێ بکرێت، خێر خوای خەڵك

دەم شیرین کردن- بەرتیل دان بە کەسێ بۆ ئەنجامدانی کارێك

دەم قاڵی، دەمە قاڵی- مشتومڕی دوو کەس لەسەر شتێك، کێشە بەقسە، دەمە قڕە، بەردەق بەردەق لە نێوان دوو کەس دا، دوو کەس قڕە قڕیان بێ

دەم کڕ- بێ دەنگ

دەمگرتنەوە- خۆ گێڕانەوە لە خواردن، پارێز لە خواردن

دەم گەرم- مەردومی قسە ڕەوان، وتار بێژی چاك

دەم لە پوش- بەش بڕاو، مافنگی

دەم لێك نان- مردن و هەناسە بڕان، مردن

دەم نانە دەم، دەو لە دەو نان- مشت و مڕ کردن

بەڵام نەیدەویست دەم بنێتە دەمی کابرایەك کە لە ترسی کارو زەحمەت کێشان بۆتە پاشماوە خۆری ئاغا

گەدا ل١٣٤

دەمو پل، دەوو پل- قسەزان، قسە ڕەوان

شیرین بە دەمو پلە

دەمو دوو، دمو دوو، دەو دوو- قسە گفتوگۆ، ئاخافتن

ئاسۆ دەمو دووی خۆشە

دەمە تەقی، دەمە تەقە– گفتوگۆی نێوان دوو کەس، قسەو گفتوگۆ کردن بۆ ڕابواردن

دەو دەوانی– مشتو مڕ، بەردەق بەردەق

دەو دەوانی مەکە – واتە مشتو مڕ مەکە

دەو پێ بوون– سوودو قازانج دیتن لە کارێك

دوو شەش– زۆر باش

دوو شەشی هێنا– زۆر سەرکەوتن– وەدەست هێنان

دوو شەشە بۆی– زۆر باشە بۆی

دەم هەڵپچڕان– قسە کردن، قسە دەست پێ کردن

بۆچی دەمت هەڵناپچڕێت– واتە بۆ قسە ناکەیت

دەم هەڵهێنانەوە– خۆ ئامادە کردنی مەردوم بۆ قسە کردن، ئامادە بوون بۆ وەرام دانەوە

دەنگ لە دەر– بێ شەرمو بێ حەیا

دەو تێك نان– کەسێ قسەی بۆ نەکرێ

دەوڵەت کەتی– لێقەوماو، دارایی نەماو

دەوی حەزیای، دەوی شێری– ژێر چەپۆکی زاڵمو زۆردار کە هیچ بەزەیی پێت نەبێ

کەوتە دەوی شێری

دەهۆڵ دڕان– ڕیسوا بوون، ناوزڕان

دەهۆڵ لە دوا کوتان، دۆڵ لەدوکوتان– تێگەیاندنی خەڵك لە کاری ناهەمواری کەسێ کە حەزی لێ نەکەیت

دوڕ ناس– زۆر زیرەكو شارەزا لەکار

دۆمبەلان نیە– بێ کەسەی نیە، خاوەن خزمو کەسو کار

دۆم– بە ماڵێ دەڵێن هیچی نەبێ

چۆن بێ بەرچایی ئەڕۆن خۆ ماڵەدۆم نیە...

ژان ل١٥

دێزە- شووم، جوت قۆشە، بێ قەرە

دیزە بە کوڵ- بێوەژنێك کچێکی پاك‌و تەمیزی هەبێ لەوە بترسێ کە مەردوم نەنگی بخەنە پاڵ

دیزە بە کوڵ- کەسێك کە خاوەنی ماڵ‌و مناڵ یا داراییەکی زۆر بێت‌و نەتوانێ بە ئاسانی کۆچ بکاو بار بکا، کەسێ لەبەر پاراستنی ماڵی زۆر ناوێرێ کۆچ بکات

دێو- ئادەمیزادی ناشرین‌و ناقۆڵا

ئەو زەلامە دەڵێی دێوە

دیزە بە دەرخۆنە- داپۆشین‌و شاردنەوەی کارێك، پۆشینی سوڕ، تەپس کردن

ئەم کارە هەر دیزە بە دەرخۆنە بێ

دێلە سە- جنێوەو واتە داك سەگ

دێڵی تەواو نیە- داکی تەواو نیە

دێلی حیزە- دایك حیزە

دێلە دڕ- ژنی زمان درێژی بێ شەرم

دین دوژمن- زۆر رق لێ بوونەوە لە کەسێ

دیوار- بەربەست، لەمپەر

دیوارمان بۆ دروست مەکە

دێو دل، پڕدڵ، دڵ قایم- ئازا لە شەڕ، نەترس

دێوەرە، چەرچی- بێ شەرم ، چەقاوەسو

لە گەل ئەو دێوەرەیەی چیم پێ ناکرێ

دێوە زمە- ئەو کەسەی خەڵك لێی دەترسێ

دێوەزمە هات

"ڕ"

ڕابوون، هەستان، ڕاپەڕین– هەوڵو کۆشش کردن بۆ لەناوبردنی زۆرداری، بەرەنگاری بوونەوەی گەل دژی زۆرداری

دێ برا ڕابن، دێ ڕابن

رابواردن– زۆر خۆش لەژیان

باشم رابوارد

راکردن، هەلاتن– پاشگەز بوونەوە، پەشیمان بوونەوە

لە راستی رامەکە

رادان– دیڕنی وورگی یەکێك

بە خەنجەر ورگی رادا

راژۆر، بەدەستەلات– خاوەن هێزو توانا

راشو روت، رەشو روت– زۆر نەدارو هەژار

... ئینجا نامەوێ باسی رابواردنی سێ لادیێیی رەشو رووتی بێ خانە خوێ سی شەو لە شوێنێك

کەرەلوتی مەنوچەر ل٣٢

راوە رێوی– فێڵو گزی دەکار هێنان، فرتو فێڵ هێنانەوە لە کاروبارا

راوەستان– بێ کار بون، بێ ئیش بوون

کارگەکەمان راوەستایە

راوەستاو– هێزو تواناو هەرمان

خوا راوەستاوەت کا

ڕستن، ڕێستن– زۆر گوتن، زۆر وەڕی کردن

بەخوا زۆری ڕست

رسقی سوارە– چەندی کار دەکاتو ماندوو دەبێ پارەی کەم دەست دەکەوێ

رشانەوە– پارە بەزۆری دان

ده دینار ڕشامەوە

برشێوە- پارەی بدە

رشتنەوە- ئاژاوە نانەوەو خەڵك بەگژ یەکا کردن

رکێف- ژێر فەرمان

هێمن لە رکێفی کەسا نی‌یە

رمبازی- گەمە کردنی منداڵان

منداڵینە دانیشن ئەو ڕمبازیە چیە

ڕو- حەیاو شەرم

پیاوێکی بێ ڕوە

ڕو- دە خۆ رادتێن

روم نایە بیبینم

ڕوت‌و قوت- نەدارو هەژار

ڕوتاڵ، ڕو ترش- دەم‌و چاو گرژ، مچ‌و مۆر

روتاندنەوە- بەزۆری شت لە یەکی سەندن

کابرا روتاندمیەوە

روت بون- فەقیر بون

رو تەخت- بێ شەرم‌و چەقاوە سو

ڕوتەنك- ساویلکە، بەشەرم، خەجاڵەتی

روتی- هەژاری، نەبوونی

روح- زۆر خۆشەویست

روح بە روحێن

روح بردن- ترساندن، زراو بردن

منداڵەکەت روح برد

روح بردی- ترسێنەر، زراو بەر

روح بڕین- ترساندن‌و تەمبێ کردن

روح پەرێ، روح سوك- خۆشەویستو بەڕێز
ژنەكی روح پەرێیە
روح چوون- زۆر ترساندن، زراو چوون
روح دەرهاتن- ئازاری زۆر پێ گەیاندن
لەگەڵ لێدانی روحم دەرهات
روحی رەوانم- زۆر خۆشەویست
روحی رەوانم چیت گەرەكە
روحەكەی، روح- خۆشەویستی، ئازیری
روح زل، روح گەورە- خۆبین، بە فیز، بەدەعیە
روح سوك- خۆشەویست لەلای خەڵك
"... سەر سپیو هاودەمی دایكم بوو... روح سووك ، قسە خۆش، نوكتە باز بوو
تاریك روون- ل٥
روح نەمان- ئارام لەبەر بڕان
گوتم بێنە ماچت كەم روحم لەبۆت نەمایە
روح لەبەر نەمان- زۆر لاواز بوون
رووخان- بەزینو ورە بەردان
كابرا رووخایە
رووخان- نەمانی رژێمو لەناو چوونی
رووخاو- بزیو ورە بەرداو
رووخۆش- قسە خۆش ، بەگفتو لفت، دەم بە پێكەنین
فەرەیدون ناو بوو بەهێزو دانا جوانو پێگەیو دڵ تەڕو ڕووخۆش
هەمیشە بەهار
روو بازاری- بەڕمین، برەودار، شتی بەدیمەن جوان كە زوو بفرۆشرێ
روداماڵاو، روداماڵاو- روداماڵیاگ- بێ شەرمو بێ حەیا

رو ڕەش– گوناحبار، شەرمەزار، خەجاڵەت

ڕو ڕەشت کردین

ڕو ڕەشی– تاوانباری، گوناحکاری، شەرمەزاری

ڕو زەر، ڕو زەرد– خەجاڵەت، شەرمەزار

ڕۆژ– کات، سات

ڕۆژ هەیە هەرزانە، ڕۆژ هەیە گرانە

ڕۆژ، ڕۆ– وەخت– هەل

ئەمڕۆ ڕۆژی منە

ڕۆژتان دێت

ڕۆژ بەسەر بردن، ڕۆژئاوا کردن– قەتاندن، دان بەخۆدا گرتن و گوزەران کردن هەرچۆنێك هەڵسوڕا، رابواردنی ڕۆژگاری ناخۆش

ڕۆژە ڕەش– کات و ساتی زۆر ناخۆش کە گرتن و کوشتن دیتە ئاراوە

ڕۆژە ڕەشە تووشی بووینە

ڕۆژی ڕەش– بەدبەختی، چارە رەشی

لە مالی یەك دوو لیرەکەم قایم کردووە بۆ ڕۆژی رەش

کەرەلوتی مەنوچەر– ل٢٦

ڕۆژ لێ ئاوا بوون– کات و ساتی ناخۆش کە مرۆۃ تووشی کاری ناخۆش دەبێ

ڕۆژ هەلات– سەرەتای خۆشی و شادی کە توشی مرۆۃ دەبێ

وا ڕۆژ هەلآت لە بەندەنی بەرزی ولآتەوە

ڕۆژی روناك– کات و ساتی خۆشی و سەرفرازی

هەمە هیوا بەدوا ڕۆژێکی روناك

تاریك روون– ل١٥٦

ڕۆژی رەش و تاڵ– کات و ساتی زۆر ناخۆشی ڕۆژگار کە تووشی مرۆۃ دەبێ

من لە ژیانم دا ڕۆژی رەش و تاڵم زۆر دیون...

تاریك روون– ل٦

روو سارد– گرنگی و بایەخ پیّ نەدان

چوومە لای بە رووساردی بەخێری هێنام

روو ساردی– گرنگی پیّ نەدان بە یەکی

نازم بۆ رووساردی لە گەلم

روو سپی– مرۆی بێ عەیب

رووم سپییە لەناو میللەت

رووسپیەتی– خوێنی نیشانەی بوك، کچێنی بوك

روو سور– مرۆی بێ عەیبو عار، یەکێك کە بێ نەنگو خەوش بێت بە هیچ جۆرێك نەنگێك رووی تێ نەکردبێ

روو سووری– بێ نەنگی مەردوم

روو سەخت– روو قایم– کەسێك هەرگیز تەریق نەبێتەوە، بێ شەرم

رووشکان– تەریق بونەوەی مەردوم، خەجاڵەت بوون

روو شکاندن– تەریق کردنەوەی مەردوم، خەجاڵەت کردن، تەریق کردن

روو شکێن– تەریق کەرەوە، کەسێك کە زۆر مەردوم تەریق دەکاتەوە

روو زەرد– (١) سەرنەکەوتو لە کارێك

(٢) شەرمەزار

روو قایم– بێ شەرم لە قسەدا، کەسێك هەرگیز تەریق نەبێتەوە

رووی گەلێك قایمە

روو کراوە– کەسێك شەرمی شکابێت، شەرم نەکەر لە خەڵك بۆ قسەو روو بەروو بوون

روو کرن، روو کردن، لەڕوو هاتن– شەرم کردن

... ئەمانە روویان بکرێتەوە هیچ بەخۆشی ناوەن

گەدا– ل٦٧

رووکردنەوە، رووکرانەوە– لەشەرمنی رزگار بون، شەرم شکاندنی یەکێك

روو گەش– بێ مچ و مۆری

کاتێك دیتیان سورتك وا بەروو گەشی‌یەوە بۆ لایان دێت

بۆرە ل٥٥

روو گرتن– شەرم کردن

روو گرژ، رووتاڵ، رووترش– کەسانی تورەو مچ‌ومۆر، روو هیشك

روو گرژی– تورەیی‌و مچ‌و مۆری

رۆستەم– بەیەکێ دەڵێن کە زۆر ئازا بێ

رۆڵە– ئازا، بوێر، نەترس

رۆڵەی کوردم فێری هەورازو لێژم

روو لێ نان– تکا کردن لە یەکێك بۆ کردنی کارێك، تەکلیف کردن

روو لێ وەرگێران– بێزاری کردن لە کەسێ، زویر بوون لە یەکێك

رەدو کەتن– لەرووی سوکیەوە بەیەکی دەڵێن کە پەیرەوی کەسێکی خراپ‌و نالەبار بکاتەوە

روون– شادمان، کەسێك بە کەیف بێت

ئاروونە– شادمانە

رووناك– خۆشی‌و شادی کە پەیدا دەبێت

رووناکیەك پەیدا بوو، دوا رۆژ رووناکە

روونەدان– گرنگی پێ نەدان، بایەخ پێ نەدان

تومەس زۆراوبەگ گوتبووی شێخ ئەوەندە رووئەدا بەو مسکێنانە

گەدا– ل٦٧

روو نەرم– شەرمن، ساویلکە

رۆن لەمیش گرتن– بە مرۆڤی قرچۆك‌و روزیل دەڵێن

روو هاتن– شەرم نەکرد لە گوفتارو کردارا، خەجاڵەت نەبوون لە وتن یا لە کردن

روو هاڵماڵاو، رووداماڵاو– مەردومی بێ شەرم

ڕەپاو ڕەپ، ڕەپو ڕاست، کورتو کرمانجی– ووتنی شت بە ئاشکرا، بێ شاردنەوە

ڕەپاو ڕەپ پێم گوت

ڕەجەب سەرپاڵەیە– بەیەکی نابووت دەوترێ کە کارێکی کەوتبێتە دەستو نەتوانێ خزمەتی خەڵکی پێ بکات

ڕەزڵخوا– ڕووتو نەداری تەواو، زۆر هەژار

ڕەژو– خەراپ، نەباش

ماڵەکەت بە ڕەژو دەدەمێ

ڕەش– هەموو

ڕەشبگیرە– هەموو کەس بۆ شەڕ ناردن

ڕەشایی، ئاوخۆرەوە– لادێیی کە جووتو بەرەی نەبێ، گوند نشینی بێ جوتو گا

ئەوانەی ڕەشایشن دیسان وەکو هەندەڕان مانگی سێ ڕۆژ بێگار ئەکەن

گەدا– ل١٢٢

ڕەش بوون– کەس نەویستن، ڕەزا قورس بوون لە پێش چاوی یەکێك

ڕەش بوونەوە– کوژانەوەی چرای دەروون

ئەوەندەت سوێند خوار ڕەشبوویتەوە

ڕەش پۆش، ڕەش گرێدان– ئازیەت بار، غەمبار، مەلول

ئەسیرن ئێوە، بۆیە ڕەش پۆشم

تاریك ڕوون– ل٨٤

ڕەش کردن– ڕەزا قورس کردنی یەکێك لەلای یەکێك

برایان لەبەر چاوی ڕەش کرد

ڕەشکوژ– یەکێە کە زۆر کەس بە یەکجاری بکوژی، کەسێ کە بێ ئاگا پیاو دەکوژێ

ڕەشە جوو- جوولەکەی موکر لەدینی خۆیدا، جوولەکەی کە زۆر باوەڕی بە دینی خۆی هەبێ

ڕەشەکە- خۆهەڵکێشێ هیچ کارە

ڕەقە کار- لاسار، نەساز لەگەڵ خەڵك

ڕەق و وشك، ڕەق و تەق- زۆر لاواز، زەعیف

باوکت ڕەق و وشك بویتەوە

ڕەگ داکوتان- مانەوەو جێ گیر بوونی یەکێك لە شوێنێك

ڕەنج بەبا- کەسێ کە بەهرەی لە ئەرکی خۆی پێ نەگەیشتوە

ڕەنجی فەرهاد- کارێك زۆر بخایەنێ ماندوبونی زۆری تێدابێت، (٢) کاری بێ سوود

ڕەنگ کردن- هەڵخەڵەتاندن، خاپاندن

ڕۆژهەڵات- کات و ساتی خۆش هاتنەوە

... دەرفەت هاتەوە ڕۆژی کورد هەڵاتەوە...

شەرەف- ل٢٨٥

ڕەهندە- بنیادەمی پان و پۆڕ

ژنێکی ڕەهندەی پان و پۆڕە

ڕێ بەر خستن- سپاردن کارێ بە کەسێك، ڕێ نیشاندان

ڕێ بەرنان- ڕێ لەبەرنان، ڕێ بۆ دانان-١- تەگبیر کردن بۆ کەسێ،٢- پیشاندانی ڕێگایەکی خراپ بۆ کەسێ

ئەم ڕێ یە مەنێرە بەرم

ڕێ بەدی کردن- شارەزایی و زانین لە شتێك

هێمن لە خوێندنا ڕێ بەدی ئەکا

ڕێ بەکونە مار بردن- شارەزاو فێڵباز

ئەوەندە چا زان و ژیرە ڕێی بەکونی مار دەبرد

بۆرە ل٣٥

ڕێ تێ چوون- شیاوی پێك هاتن، ڕەنگە

" ئەم کارە ڕێی تێ ناچێ بکرێ"

ڕێ تێ کەوتن- بە هەڵکەوت چوونە شوێنێك

ڕێگا، ڕێبان، ڕێ- ئەو بیرو باوەڕەی کە یەکێك پەسندی دەکاتو لەسەری دەڕوا

ریس لێ بوونە خوری، ریس لێ هەڵوەشانەوە- کار لێ تێك چوون

ڕەش‌و سپی دەرکەوتن- (١) باش‌و خراپ دەرکەوتن

(٢) ئازاو ترسنۆك دەرکەوتن

ڕێکبون- ئاشنایەتی‌و تێکەڵی لەگەڵ یەکێکا

ڕێ نیشاندان، ڕێگا دیتنەوە- تەگبیر بۆ کردن، ئامۆژگاری کردن

ڕێ ون کردن- گومرایی بوون، هەڵەکردن

ریخاوی- مرۆڤی خوێڕی‌و بێکارە

ڕیس‌و گوریس- کردار یا گوتاری دورو درێژ

من تاقەتی ئەو ڕیس‌و گوریسەم نیە

ریش سپی- کەسانی قسەزانی‌و قسە ڕەوانی کۆمەڵێك یا خێزانێك، پێك هێنەری کاران، تەگبیرکەر

بامن کەیخوداو ریش سپیتان بم بە کارتان رابگەم

شەرەف ل٣٧

ریشی خۆیانی گرتەوە- خۆیان توشی ئاژاوە بوونەوە، خۆیان تووشی بەڵا بوون، خۆیان توشی زەرەر بون

ریشە بڕ بوون- برانەوەی خێزانێك یا تیرەیەك

ریشە داکوتان، ڕەگ داکوتان، بنج داکوتان- جێگیربوونی یەکێك لە شوێنێك

ریش دانە دەست- کاروباری کەسێ بکەویتە دەست کەسی نالایەق

ریشە دەرهاتن- کەنەفت بوونی یەکێك بەهۆی شتێکەوە

ریشەم دەرهات بەدەست تۆوە

ریشه دەرهێنان- کەنەفت کردنی یەکێك

باوکمم لە ریشە دەرهێنا

رێوی، ریوی- فێڵ باز، ساختەچی

ئەو کابرایە رێوییە

ریویە بۆر کڕیاری کەوڵت هاتووە- لێدان و کوشتنی پیاوی فێڵباز

ریوینە- فێڵ بازن

## "ز"

زا– بەند بون و گیربوونی یەکی لە جێگایەك و نەهاتنەوە وەك توانج دەگوترێ

ئەری نەزا– هەر نەهاتەوە

زاخاو– خەم و خەفەت

ئەوەندە زاخاو مەکە بە دڵما

زاخاودان، زاخاو دانەوە– پێ خۆشبوونی دڵ بەتووش بوونی دوژمنت بە ناخۆشی یەك

بەدەرکردنی دوژمن دڵم زاخاو درا

زاخاو دان– تەماشا کردنی یەکێك بۆ یەکێکی جوانی دڵبەر

ئەوەندە تەماشای ئەو ئافرەتەی کرد زاخاوی چاوی خۆی دا

زاخدار– مەردومی بە جەوهەر، مرۆڤی خاوەن هەڵوێست

کابرایەکی زاخدەرە

زارو زمان– قسەزان

بە زارو زمانە

زار بەستن، زار بەستران– قسە بۆ نەکران

زارم بەسترا

زار بڵاو– ئەو کەسەی نهێنی ناتوانێ بپارێزێ و بڵاوی دەکاتەوە، تێدا نەوەستاو

ئاسۆ زار بڵاوە

زار خوران– کەسێ زۆر حەزی لە قسان بێت

زار خۆش– ئافەرین بۆ گوتەت

زار نەرم، دەم تەڕ، زمان تەڕ، زمان لوس– کەسێ بەقسەی خۆش مەردوم فریو بدات

زارە ترەك– کەسێك لە ترسانا تۆقی بێ

زاره ترەکبون، زەهرە ترکبون- تۆقین لە ترسانا
زاره ترەك کردن- ترساندنو تۆقاندن
زامدار، بریندار- ئازار چەشتو تووشی بەلاهاتو
زام کولانەوە، برین کولانەوە- ئازارو ناخۆشی وەبیر هێنانەوە
شیرین وامەچو زام ئەکولێتەوە
سالآنی پێشوم وەبیر دێتەوە
فۆلکلۆر
زبان باز- درۆزن
زرت کێشان- گاڵتە پێ کردن
زرتم لۆ دەکێشی
زگ- بەڵا، ناخۆشی
لەو زگەش قوتار بووم
زگ بەخۆ سووتان- بەزەیی بەخۆدا هاتنەوە
... فرمێسکی زگ بەخۆسووتانی دیسان لە چاوانی دوو ریزو سێ ریز رێچکەی بەست....
غەوارە ل١٤
زگ بەردان- زۆر خواردن
زگ برسی- هەژار، نەدار
زگ پێ سووتان، زگ پێ شەوتین، زگ زوورانەوە- بەزەیی پێدا هاتنەوە
... کافری حەوت دینان زگی پێ دەسووتا
غەوارە- ل
لێیان دا ئەما لێدان کافری حەوت دینان زگی پێ دەسووتا
بۆرە ل٤٧
زگ تێر- دەوڵەمەند، زەنگین
زگی تێر ئاگای لە زگی برسی نیە

پەند

زگ دڕاو- زۆر خۆر

ئەو زگ دڕاوە بەمن تێر ناکرێ

زگڕەش- لە دەروونندا ناسان، دەغەزدار، قین ئەستووری دڵ پیس، دەبنەوە بڕ، ڕکۆنی، ڕق لە زگ

زگ ڕووت- هەژارو نەدار

زگ سووتان- منداڵ مردن

خوایە تووشی زگ سووتانم نەکەی

زگ هێشان- خەم خواردن لە کارێك

زەنگ زریان- حەیا چوون

زگ سووتاو- فرزندە مردگ، ئەو کەسەی منداڵی مردووە

زگ لەوەڕاندن- یەکێ کە بە هەوانتە خۆی بژیەنێ، چلێسی، ماڵەو ماڵ کردن بۆ خواردن

زگ لەوەڕێن- مەرایی کەر، لەگام

زگ شۆرێ پێکەوتن- ماندوو بوونی یەکێك بەهۆی هاتوچۆی زۆرەوە

زگ گورگ- لە دەروونەوە فێڵبازو ساختەچی

زل، گەورە- خاوەن پلەو پایەو بەتوانا

زلبوون، گەورەبوون- پایە بەرەو ژوور چون

زەلام- بۆ شتی گەورە دەڵێن

بەردێکی زەلامی دامێ

زمان بڕین- بوار پێ نەدان بە یەکێك کە قسان بکات

زمان بڕاو- بوار پێ نەدراو

لە شاعیری زمان بڕاو

لە شاعیری دەفتر دڕاو

هێمن- تاریكو ڕوون ل١٥٧

زمان بەستران– قسە بۆ نەکران

زمان بە خواری گەڕان– قسەی خەراپ کردن

زمانم بەسترا هیچم پێ نەگوترا

زمان پاك– جنێو نەدەر، یەکێ کە جنێوی بەسەر زمان دا نەیەت

زمان پاکی– ناو نەبردنی کەسێك بە خراپە

زمان پیس– بەدبێژ، جنێودەر

زمان پاراو– قسە زان

زمان تەقەت– کەسێ کە سوڕ ئاشکرا ناکات، یەکێ نهێنی لەلا بێ و ئاشکرای نەکات

زمان چەور– قسە خۆش و باش، فریودەر

زمان قایم، زمان قەیم– زمان تەقەت

زمان قورس– کەم دوو– کەم بڵێ

زمان تاڵ، زبان تاڵ– مەردومی قسە رەق

زمان درێژ– یەکێ کە لەئەندازەی خۆی زیاترو بەرەو ژوورتر دەربارەی مەردووم بدوێ، چەقە سرۆ، چەنەباز، زۆر وەڕ

دژو ڕکونی زمان درێژو جنێو فرۆش و دەست و دڵ ڕەش و خوێن ڕێژ بوو

شەرەف ل٤٦٥

زمان ڕەپ– قسە رەق

خوشکە ئامین ئەتوو چاکی ناناسیت چەندی بڵێی زمانی ڕەپە

غەوارە ل١٦٨

زمان رەش– دەم پیس، قسە رەق

زمان شیرین– یەکێك کە قسەی خۆشبێ لەگەڵ مەردووما، قسە خۆش

بەزمانی شیرین مار لەکون دێتە دەر

زمان پەل، دەم دڕاو، دەم شڕ، دەو دڕای، زمان شڕ، زار شڕ، زار دڕاو– قسەو باس لەلا گیر نەبوون، تێدا نەوەستاو

لەپاش ئەوەی نیاز بە گیان لەسەر زمان شڕی‌و گوناهباری لە مەزنایەتی وەدەرنا...

شەرەف ل٦٣٢

زمان دڕای– زۆر وەڕ، چەقە چناوە

زمان دڕای– کەسێ قسەو نهێنی لەلای گیر نەبێ زوو ئاشکرای بکات

ئەمن لەوە دەترسێم رۆژێك ئەو زمانەی دڕایەی بەدەستی من بە بڕین بچێت...

غەوارە ل١٦٨

زمان رەش، دەمپیس، دەوپیس– کەسێ زۆر جنێو بدات

زمان گەستن– پەشیمان بوونەوەو خەفەت خواردن بۆ شتێك کە لە دەستت چووبێ، پەژیوانی

زمانی خۆم گەست کە بۆ ئەم کارەم کرد

زمان لێ دەرهێنان– گاڵتەپێ کردن

زمان گیران– کەسی لە مشت‌و مڕا ناتوانێ وەلام بداتەوە

لە داخان هەناوە کوتەی پێ کەوت‌و زمانی گیراو مردو سوت قسەی بۆ نەهات

غەوارە ل١٧٠

زمان لەزاری‌دا نەبوون– لە کات‌و ساتی ناخۆش نەتوانی قسەی بکەیت

زمان لوس– کەسێ کە بەقسەی خۆش مەردوم لاس بدات

زمان لێدان– شوفاری کردن‌و بەگرتن دانی خەڵك

شاهۆ بۆ گیراوە، زمانیان لێ داوە

هەر ئەو زوڕنایە مابوو

زۆج– غەشیم، نەزان

بڕۆ هەی زۆج

زورنا– دەنگ‌و باسی هەڵبەستراو

زوڕنا لێدان– یەکێ کە قسان دەکا بەلام کەس گوێی بۆ راناگرێ

لۆخۆت زوڕنای لێدە

زۆڵ- فێڵباز، تەلەك باز

مامەلە لەگەڵ ئەو زۆڵەی ناکرێ

زەڕە زەڕ- گریانی نابەجێ

کوڕە ئەو زەڕە زەڕە چیە هەتیو

زەردو سور- منداڵی جوانکیلە

نەوزاد کۆشێك زەردو سوری لەپاش بەجێ ماوە

زیرەکی - چاك، چاکە

زیرەکیت کرد کە دەنگت نەکرد، دەنا لێت دەبوو بەشەڕ

زیندە بەچاڵ- ئاوات و ئارەزوو نەهێنانە دی

زەڕناس، دوڕناس- مەردومی دانای شارەزا لە کردەو گوفتارا

زەرهاتن- یاخی بونی یەکێك بە جۆرێ کە بەرزتر لەخۆی بدوێ و قسە بکا

زەڕین- لەخۆ بایی بوونی یەکێك بە پلەو پایە یا بە پارە

پارەی دیوە دەزەڕێ

زەمانی دەقنا نوسێ- زۆر پیش ئیستا زەماوەند- خۆشی و شادی

شایی و زەماوەندە هەڵپەڕکێی کوردان دەگەری

فۆلکلۆر

زەنگ زڕان- ریسوا بوون

زەوی بە چنگ هەڵکەندن- ئێش و ئازاری زۆر

زەوین گیر- مەردومی کەفتەکاری گردەنشین

زێڕ(١) شتی بەنرخ، (٢) مرۆڤی بە حورمەت و هێمن

زێڕە- بە مرۆی باش دەڵێن

زێڕین- باش و چاك و لەبار

سەردەمی زێڕین

زیندان- نەبوونی سەربەستی و ئازادی لە وولاتێك یا لە شوێنێك

زیندە، زیندوو، زینوو- ئەسپێ و کێچ لە لەشی بنیادەم

پڕی سەری زیندەیە
زندی- مرۆڤی زیرەکی هار
زیندی خۆر- زاڵم، پیاوکوژ
زیندیکردنەوە، زیندوو کردنەوە- کاری لەدەست چوو وەکار خستنەوە
زیوان چاندن- کاری خراپ کردن لەگەڵ مەردوم

## "ژ"

ژاراو، ژەهراو- خەمو خەفەت

ژاراو دەرخواردان- خەمو خەفەت دان بە کەسێ

بابم ژاراومان دەرخوارد دەدا

ژارەمار- زۆر ناخۆش

ژیانم ژارەمارە

ژاعربیایش- دژواری کار

ژەهرە مار- ناخۆشیو دەردەسەری

چونکە بە دەردی دڵی دووچار بوو

ئەم پەندەی باوکی لا ژەهری مار بوو

مەدهۆش

ژان گرتن- ئیرەیی پێ بردنی کەسێك بە کەسێکی تر لەبەر هەر هۆیەك بێت

بە ماڵی من ژان دەیگرێت

ژانە سەر- قسەیەك کە پێت ناخۆش بێت

بە قسەکەم ژانە سەری دەگرێت

ژانە سەر- رەنجو ماندوو بونو سەخڵەتی زۆر

ئەو ژانە سەرەی توشی خۆم ناکەم

ژان کردن- (١) ماندو بوونی زۆر، (٢) ئارام لەبەر بڕانو ئیرەیی پێ بردن

هێندەم غاردا ژانم کرد

ژەهر دەرخوارد دان- زۆر ئازاردان

ژەهر لەپستی مەڕی- بە ئاکار چاكو لە ناوەوە خراپ

ژەهری مارە شەربەتم- خۆشیم ناخۆشیە

ژەهر- زۆر تاڵ

ژەهراو بەقورگ دا کردن- ئازار دانی مەعنەوی

ژەهر فرۆش– مچ‌و مۆر، تورە

ژان– خەم‌و خەفەت

زۆر لە مێژە ژانی گەلم دەسوتێنێ جەرگ‌و دڵم

ژەهراوی– زۆر خراپ‌و نالەبار

هەزار پیلانی ژەهراوی خۆم ئاسایی یان بۆ رێك ئەخەم

ئاشتی– ل٩٠

قسەی ژەهراوی– قسەی تاڵ

ژان گرتو– نارەحەت بوون لەبەر بەخیلی پێ بردن

ژن– مرۆی ترسنۆك

ژنانی– بە مرۆی ترسنۆك دەڵێن

ژوانی ژوژکان– چاوەڕوان کردنی کەسێ لە شوێنێك بۆ مەبەستێك بەلام کاورانەیێ بۆ ئەو شوێنەو هەر لە چاوەڕوانی دابن– واتە هەر نەهاتن کردنیە ژوانی ژوژکان

ژەنگاوی کردن– گومان بەیدکردن

دڵم ژەنگاوی کرد لێیان

ژیان تاریك بوون– بە رۆژانی ناخۆشیو پشێوی دەڵێن

ژیان تاڵ بوون– رۆژانی پڕ لە ئازارو ئەشکەنجە

ژیانت لێ تاڵ کردم لەکەس‌و کارت کردم

ژیان هەرزان– ئاژاوەو پڕ لە کوشتن‌و برین

ژێ– ئەوانە بەشێوەی کرمانجی داخێون، شێوەی باکوری قسە کردن

ژێر– بن– نهێنی– لە ژێرەوە کاری خۆیان ئەنجام دا

ژێر باڵ– پەنا بردە

ژێر باڵ خستن– دەست بەسەر یەکێکا گرتن‌و پەنادانی

ژێر بار– رابوون، کەوی بوون، هاتنە ژێر بار

ژێر پا، ژێر پێ– رسوا

دەتخەمە ژێر پێمەوە

ژێر پا کردن، ژێر پێ کردن، هەلە خەرجی

سەد دیناری ژێر پا کرد

ژێر پێ کەوتن– فەرامۆش کردن، بایەخ پێ نەدان

ژێر جلەکی– شتی پەنهانی، بە نهێنی، بەبێ ئەوەی کەس بزانێت کەس نەزانم

ژێر خستن، بەبن پێخستن– زیان لێدان و نابووت کردن، زەبوون کردنی یەکێك لە کارێك

ژێر دەستان– چەوساوەکان

ژێر دەست، ژێر چەپۆکە، ژێر چنگ، ژێر دەس، ژێر دەستە، ژێر دەسە– دیل، چەوساوە

ژێر دەست، بن دەست– کەسێك کە خوار دەست و فەرمان بەرت بێ

ژێر دەستی– چەوسانەوە

دیلی، ژێر دەستی، ئەسیری تاکەی

رووتی، نەداری، فەقیری تاکەی

تاریك روون– ل

ژێر دەستی کردن– یارمەتی دانی یەکێك لە کاری رۆژانەدا

لە ژێر دەستی کار دەکەم

ژێر زوان– بەرتیل

نەوزاد ژێر زووانی ناگە– واتە بەرتیلی داوەتێ

ژێر زوان چەشتن، بن زمان تام کردن– قسە لێ دەرهێنان

ژێر زەمین– بە نهێنی کارکردن

لە خەباتی ژێر زەمینی گیرا

ژێر سایە– پەنا، دالْدە

لە ژێر سایەی تۆ حەسامەوە

ژێر عەبا، ژێر پەردە– نهێنی

لە ژێر عەبا، لە ژێر پەردە- واتە بە نهێنی

ژێرو ژوور بوون، سەراو بن بوون- تێك چوون، وێران بوون

دنیا ژێروژوور بێ هەر ئەوان فرۆشیان ببێ، پەکیان پێ ناکەوێ

گەدا- ل٤٢

ژێر سەر، بن سەر- کەینو بەین

ئەم کارە لە ژێر سەری تۆدایە

ژێر سێبەر- دالْدەدانو پەنادان

بەبێ ترس لەژێر سێبەری جەنابتان بەسەر بەرم...

بۆرە ل٥٢

ژێر کاسەو بان کاسە- کەینو بەین

ژێرکاسەو بان کاسەی یەکتری ئەزانن

ژێر کەوتن، ژێر کەفتن، بەبن کەتن- تووشی زەرەرو زیان بوون

ژێر کێر، بن کیر- خزمەت کاری سووكو چروك

ژێر دەر کەوتن- روون بوونەوەی کارێکی پەنهان

ژوور ڤەچوون- بەفیزو لەخۆ بایی

ژووژیان- حەسانەوە، پشودان

# " س "

سا، سایە، سێبەر، دالدە- پەنای پەنابەر، یارمەتی دەر
لەسای تۆدا حەساینەوە
سابوون لە بن پێدان- هەڵخەڵەتاندن، فریودان
ساتۆر- تەمەڵی لەش گران
ساخ، ساغ- مرۆی بێ فرو فێڵ، پاك
... روستەم- (بەتورەبوونەوە) ناوی دارا مەهێنە پاكو ساغە
سەرچاوە- ل
سادە- بەسەزمانو گێلوکە، مەردومی ساویلکە
سارد- بێ مەیل، ئارەزوو لێ نەبوون
سارد بوون- بێ ئیلتیفاتی، بێ مەیل بوون
سارد بوونەوە- ناهومێد بوون لەکار
ساردبوونەوە- مردن
سارد کردنەوە- کوشتن
بە گوللە ساردی کردەوە
کێ بەقەد بەرگە نوشتەیەکی دیاربا، تیری ساردە کەوان ساری دەکردەوە
شەرەف ل١٥٠
ساردی- نێوان ناخۆشی، عادز بوون
بەڵام جارجار مشتو مڕێکمان هەر ئەبوو و کەمو زۆر ساردی ئەکەوتە بەینمانەوە
یاداشت رەفیق حیلمی ل٨٩
سارد کردنەوە- ناهومێد کردن، پەشیمان کردنەوەی یەکێك لە کارێك
لە ئیش کەم ساردم مەکەوە
ساردو گەرم- دەرس لە ژیان وەرگرتن- رۆژانی ناخۆشی رۆژگار دیتن

ساردو گەرمم زۆر چەشتوە

... کا حسێن کە بە ساردو گەرمی رۆژگار قاڵ بوو...

گەدا ل٤٥

ساردو سڕ- زۆر بێ مەیل‌و ئارەزوو، روو پێ نەدانی یەکێك بە یەکێك

ساردو سڕی- بێ مەیلی تەواو

بەساردو سڕی وەڵامی داینەوە

سارومار- زۆر بۆگەن

بۆنی سارومار‌ی لێ دێ

سارێژ بوونەوە- نەمانی خەم‌و خەفەت

جا ئەو کاتە بە هەتوانی ئلزادی

سارێژ دەبێ برینی نامورادی

تاریك روون- ل١٦٧

سارێژ کردن- ئاشت کردنەوەی یەکێك دڵ هێناوە جێی

ساقە چەرم- ئازاردان

سایە- داڵدەو پەنادانی یەکێ

لە سایەیا حەسامەوە

سایە بان، سایە چەور، سایەوان، سایەدار- مەردومی بەرچاوتێر کە خەڵکی تر لە سایەیا بحەسێتەوە، پیاوی مەردو خاوەن چاکە، پیاوی دەهندەو دلۆڤان

... رەکێشم کا هەتا دەم هێنێتە بەر ئاستانەی دەرگانەی خانەدانی سایە چەورت....

شەرەف ل١٣٦

سایەدار- کەسێك کە مەردوم لە سێبەریا بحەسێتەوە، پەنا دەری لێقەوماوان، کەسێك یارمەتی کەسێك بدات

سایە ووشك- مەردومی رژدی چروك، رەزیل

سبەی- دوا رۆژ، رۆژانی داهاتوو

سبەی ئەگەر شتێك بوو یەخەم نەگرن

سپڵی لا ورگ- گران جانی دەست هەڵنەگر

سپی- چاك، باش

بەختی سپی بوو

سپی بوونەوە- ئاشكرا بوون، روون بوونەوە، رۆن بوونەوە

درۆیەكی لێ سپی بۆوە

سپی كردن- كوشتن، مراندن

سپی كردنەوە- ئاشكرا كردن

درۆیەكەم لێ سپی كردەوە

سڕ بوون- تاسان لە قسەی یا هەواڵی ناخۆش

بە قسەكەم سڕبوو

سڕكردن- تاساندن

كابرام بە قسەكی سڕكرد

سلاح شكاندن- ریسواكردن، رەزیل كردن

سلاحی ئازادیان شكاند

سلسار بونەوە- مردنی ناخۆشەویست

سلسار كردنەوە- كوشتنی ناخۆشەویست

سڵقی روت- روتی نەداری بێ هیچ شت، زۆر نەبوون

چەند ساڵە هەوڵ ئەدەی گەلێك روتتری لە سڵق

رەزا

سماق دەرهێنان، سماق تروقاندن- جەزرەبەدانی زۆر، ئازار گەیاندنی زۆر بە یەكێك

سماقت دەتروقێنم- ئازارت دەدەم

سماق فرۆشتن، سركە فرۆشتن- كەسێ هەموو دەم دەموچاوی گرژبێت رووی خۆش نەبێت لەگەڵ خەڵك

سمێڵ بۆق، سمێڵ قیت- مرۆی ئازاو لەخۆبایی
سمیلە خیچکە- کەیف خۆش
لە هەوەلەوە تەنیا سورتك سمێڵە خیچکەی هاتێ
بۆرە ل٥٨
سمێڵ شۆڕ- مرۆی بێ ئاکاری بێ ویژدان
سمێڵ چەور کردن- بەرتیل دان
پێشکێشی زۆر بۆ بردن و سمێڵی چەور کردن
سمێڵ چەورانە- بەرتیل
سمێڵ تاشین- ریسوا کردن، شوورەیی بەسەر هێنان
سمێڵت دەتراشم- شوورەییت بەسەر دێنم
سندوق- بەلا گەردان، بەلا گێڕ
سندوقی سەری کوڕەکەت، (بەسندوقی سەرت بم)
سنگ داکوتان- نەڕۆیشتنی میوانی رەزا گران
سنگی داکوتاوە هەر ناڕوا
سنگ رە پێش- خۆ تێ هەڵقورتاندن
سنگ لێ کوتان- تووك لێ کردن، نزا کردن لە یەکێ
سنگ هەڵکێش- خۆشاندان و تاریفی خۆکردن، مەردومی بێ شەرمی نالەبار
سنور پەراندن- لەتام دەرچوون، لە ئەندازە دەرچوون، کاری نائاسایی کردن
سنوردانان، حەد دانان- نەهێشتنی کاری نائاسایی کردن
سوارە- زال بوون بەسەر کات و ساتدا
داشم سوارە- ساتێك کەس نەتوانی قسە بکات بەرامبەرت لەبەر هەر هۆیەك بێت
سواڵکەر، دەروزەکەر- بەمرۆی رژدی چروك دەڵێن
سووتان- فەوتانی قەرز
پارەکەم سووتا

سووتان– نابوت بوون

سووتان– تێپەڕبوون لە ڕادەی دیاری کراو دەکایەدا

سوتاندن– (١) خەڵك هەراسانو بێزار کردن بەهۆی کاری ناڕەوا

خەڵکت سوتاند

(٢) زیان لێدان

داهاتووی خۆم سوتاند

سووتاو– قەرزی فەوتاو

پارەکەم سوتابو وەرم گرتەوە

سووتاو– زۆر شارەزا لەکارو ئیش کردندا– کارزان

سوك– بێ نرخ، ئەو کەسەی حورمەتی نەبێ لەناو خەڵکدا، مەردومی بێ مایەی بێ نرخ

بڕۆ هەی سوكو چروك

سوك– بە ژنی سۆزانی دەڵێن

ژنە سوك بوو کوشتیان

سوك بار، بار سوك– کەسێك کە ئەرکی کەم بێ

سوك باری– کەم ئەرکی

سوك کردن– ریسوا کردن

سوکت کردم عەقڵت بردم

سوتام نەمام وەرە قوربان

فۆلکلۆر

سووکی– بێ نرخیو بەد ناوی یەکێك

سوولکە– ساوا ، منداڵ

دوو سوولکەم هەیە

سەد لەسەد، سەدوسەد، سەدی سەد– زۆر تەواو، تەواو بێ کەمایەسی

سەد لە سەد بەیانی ئەڕۆم

سەر- تاکێك لە مرۆو ئاژەڵ، تاقە گیاندارێك

دە سەر خێزانم هەیە

سەراو دەراو دیتن، گەرمی و ساردی دیتن- قاڵبووی رۆژگار

سەر ئەستوور بوون- تورە بوون، قەلسبوون

سەر ئێشان، سەر هێشان، سەریشان- رەنج و سەخلەتی، ناخۆشی و نارەحەتی

سەر ئێشانی تووشی خۆم ناکەم

سەر ئێشاندن، سەر هێشاندن- جاڕز کردن، بێزار کردن

نامەوێ سەرتان بیەشێنم

سەر بادان- نارازی بوون، ناقایل بوون، ئامادە نەبوون بۆ کردنی کارێك

سەربار- زەحمەتی زۆر، ئیش و کارێکی لاوەکی کە خرابێتە سەر ئیش و کارێکی تایبەتیت

سەربزێو، سەربزۆك- نەگوجاو، نائارام، مرۆی جەربەزەی هاروهاج

سەر بزێوی- جەربەزەیی و هاروهاجی

سەربزێوی مەکە

سەر بڵن، سەر بڵند، سەربەرز، سەرفراز، سەر ئەفراز، سەرهەفراز- ئابڕوداروو لەسەر، یەکێك کە نەنگ رووی تێ نەکردبێ

بەسەربەرزی بژی بەنان ئاوێك

سەر دامەنوێنە بۆ هەموو ناپیاوێك

خەیام

سەر بڵند کردنەوە، سەر قیت کردنەوە، سەربەرز کردنەوە- دووبارە پایدا بوونەوەی کارێك، راپەڕین و ئەشقی بوون

پێشمەرگە سەریان بڵند کردۆتەوە

سەر بڵندی، سەربەرزی- بێ نەنگی، شانازی بەکاری باش

سەر بەهەش- بەدبەخت، کلۆڵ

کابرایەکی سەربەهەشە

سەربەرە ژێر- شەرمەزارو خەجاڵەت

سەربەرە ژێرمان مەکە

سارپاڵە- کەسێ کە دەبێتە پێشەنگ بۆ ئەنجامدانی کارێك

سەر پێ سپاردن- باوەڕی تەواو بەکەسێ کردن، متمانە پێ کردن بەکەسێ

سەری پێ بسپێرەو خەمت نەبێ

ئاکۆ لەوانەیە کەسەری پێبسپێریت

سەرپێچ- کەسێك کە ئەو فەرمانەی پێ دراوە نەیکا، یاخی

سەرپێچی- خۆدزینەوە لە کارێكو نەکردنی

سەرپێچی کردن- لاساری کردن

من تا ئێستا هەرگیز لە کۆیلەیی‌و نۆکەری ئێوە سەرپێچیم نەکردوەو ناشی کەم

شەرەف ل١٣٦

سەر پێچانەوە- سڵەمینەوەو کۆکردن

ئاسۆ لە هیچ شتێك سەرناپێچێتەوە

سەرپێ شۆڕکردن- سەرپێ نەوی کردن- سەرپێ دانەواندن- سەرپێ چەماندنەوە- سەرپێ هێنانە خوار- رامکردن، بەرفەرمانکردن

سەر پێوەنان- مل نان‌و راست رۆیشتن، بەکۆمەڵ بەرەو شتی چوون

لەشکرەکە سەری پێوەنا

سەرتاشین، سەر تراشین- ریسواکردن، شوورەیی بەسەر هێنان، سوکایەتی بەسەر ژن هێنان

لەسەر دزی سەریان تاشی

سەرتڵ- شتی نایابی هەڵبژاردە- هەرە باش

سەرتیا چوون، سەر تێداچون، سەر تێ چون- بەیەکجاری فەوتان، مردن لە پێناوی شتێکا

سەر تێکردن- هاتو چۆ کردن بۆلای یەکێك

هێمن سەری تێ کردوم

سەر تێکردن- دەم ژەندنە شتێكو لەناو دانی، ماڵ بەخت کردنی زێدە لە پێویست

ژێکاف سەری کردوەتە دارایەکەی

سەرتەزێن، کەللە تەزێن- خواردنەوەی زۆر سارد

سەر جۆیی کردن- دروست بوونی پیاو لەگەڵ ژنی خۆی

سەرچاماندن- سەردانەواندن، تەسلیم بوون

سەر دامەنوێنە بۆ هەموو ناپیاوێك

سەرخواردن- (١) بێزار کردن، هەراسان کردن، (٢) کوشتن

ئەو منداڵە سەرمی خوارد

سەرخواردن- مردنی یەکێك دوای پەیدابوونی یەکێك، منالی شووم

نەوزاد سەری باوکی خوارد

سەرەخۆرە- شۆم، دمور، بەد

مالی سەرخۆرەی لەکۆیی

سەرخواردن- حەز لێ بوون لە کارێك

سەرد، سارد- مەردومی بێ هەوەس لە شتێك

سەر داخستن، سەرشۆڕکردن، سەرنەوی کردن- شەرمەزاریو تەریقی، لەشەرمان سەر دەبەر خۆ نان

سەردان- ١- خۆدە پێڤاونان، دەپێناو ناو- لە پێناو چوون، ٢- دیدەنی کردن

سەردانان- گیان بەخت کردن لە پێناو شتێکا، خۆ بە کوشت دان

سەر دەرچوون- شارەزایی لە کاری یا کرداری

ئازاد لە هەموو شتێکا سەری دەرئەچێ

سەردەست- ئازاد، سەربەست

سەردەستە– بژاردە

سەردەق شکاندن–• کردنی کارێك یا ووتنی قسەیەك کە هێشتا کەس نەی کردبێ یا نەی وتبێ، بەر لەخەڵك دەست بەکار کردن

سەردەقی ئەم کارە مەشکێنە

سەر راست– یەکێ لە پەیمان و ئیش و کارا بێ فێڵ بێت، بێ گزیو لاری، ئەمین لەکار کردن

سەر راستی– ئەمینی، بێ گزی و دزی، پەیمان دروستی و راستی

خەلیل بەگ بوو. شاتوماسب بردیە جەم

خۆو بۆ سەر راستی لەراست کاروباری دنیاداری

شەرەف ل٦١٥

سەر رووت– منالی خوێندەواری شار

سەر رەق، سەرسەخت– مەردومی رق ئەستوور کە لە کێشی کەسا نەبێ

لەم سەر رەقییەوە دەماری زلیان        بێگانە دەبن سواری ملیان

شەرەف ل٣٦

سەرسووك– مەردومی کەم ئیش، کەم ئەرك

سەر سووك– ئاسوودە

سەر سووکی– کەسی کەم ئیش و کار، کەم ئەرکی

سەر سووکی– ئاسوودەیی

سەر شۆڕ– بەزیو لەشەڕدا

سەرشۆڕ– درۆ لێ ئاشکرا بوون

سەرشۆڕ– کەتن کەر

دوژمن شکاو بەسەر شۆڕی هەڵاتن

سەرشۆڕ– یەکێك کە لەبەر نەنگ و بەدناوییەك تەریق بووبێتەوە

سەر شۆڕ– بێ ناموسی قبوڵ کردن

سەر شۆڕ بوون– تەریق بوونەوە

سەرشۆڕ کردن– بەد ناو کردنی یەکێك

سەر شۆڕی– بەدناوی، شەرمەزاری، حەیاچوون

ئەگەر دە رۆستی نەهات سەرشۆڕی و سووکایەتی‌یەکی بۆ دەمێنێتەوە

کۆرئوغلو ل١١٨

سەرکردن– سەر چیخ چوون– بەهەلەدا چوون لە ووتەیەك یا لە کارێك

لە قسەکەت سەرت کرد

سەرکردن بەگوما– سەر بەگوما کردن– لە بەین بردن، لەناو بردنی شتێك

سەرکز– مەردومی بێ دەنگو مرۆی کڕ

بەندەی سەرکزو شکستە باڵم     خۆڵی بەردەرگات بەچاو دەماڵم

شەرەف ل١٣٧

سەرکزی– بێ دەنگی، کڕی

سەرکزی دڵ وریا

سەر کەچەڵ کردن– بێزار کردن، هەراسان کردن

سەر لە ئەژنۆ– غەمبارو غەمگین

سەر لە قوڕنان– (١) تووشی بەڵا کردن، (٢) سەر لەقوڕ گرتن– پەژارە بوون

سەری لەقوڕی نا– تووشی بەڵای کرد

سەر لێ ئەستوور بوون– زۆر توورە بوون لە کەسێ کە کارێکی ناڕەوا بەبەر چاوتەوە ئەنجام بدات

سەرگران– پێ ناخۆش، کارێك یا کردەوەیەکت لا ناخۆش بێت

بە قسەکانم سەرگران بوو

سەر گرتن– گەوادی

سەرگەرد– کەسێك کە خۆی کردبێ بە باڵا گەردانی یەکێك

بەسەرگەردی باڵاتبم

لە پارو پێرارەوە

فۆلکلۆر

سەر گەرم- تورەو تۆسن

کوڕم تۆ هێشتا لاوی‌و سەرت گەرم‌و زوو هەڵدەچی

شەرەف ل۱۳۷

سەرگەرم- سەرخۆش، مەست

سەرگەرم- یەکێك کە گەرم‌و گوڕ بێت لە کارێکا

سەرگوم کردن- کوشتنی یەکێ‌و بزرکردنی

سەر لەبەردان- ناهومێدبوون

کورە ئەمجارەش سەری دا لەبەرد... هەر وەخت بوو خۆی بکوژێ

زەبووك ل۷۰

سەر لێ بادان، سەر زڤراندن- ناڕەزایی لە کارێك یا لەووتارێك

سەر لێ دەرچوون، سەر لێ دەرکردن- لێزانی‌و شارەزایی یەکێك لە کارێك

مزیر گوتی: تۆ سەرت تەواو لە دنیا دەرناچێت

بۆرە ل٤٨

سەری داوێ بزر بوە، سەری کلافەکەی ون بووە، سەری گوریسی بزربوە- بەکارێك دەوترێت کە چەواشە بووبێ چارەسەری بەزەحمەت کەوتبێ

سەرما بردو- کەسێك کە بەسەرمای قەلسە

سەروپێچکە، سەرکەو بنکە- منداڵی تەمەن بچووك

میر ناصر دو کوڕی سەروپێچکەی لەپاش بەجێ مان...

شەرەف ل٤٤٧

سەر نانە سەر- نزم کردنە سەر، قسە زۆر کردن لەگەڵ یەکێکا بۆ تووڕە بوونی

سەرنانەوە، سەرنیان- (۱) نوستن، (۲) مردن، (۳) دەربەدەریی‌و دوورکەوتنەوەی یەکێك لەشوێنی خۆی، ئاوارەبوون

سەروماڵ- هەرچی هەیەو خۆشەویستە

سەرو ماڵم بەقوربانی ئازادی

سەرە چەرم- زەرەرو زیان

سەرەنگرێ- یەکێ کە تووشی چورتمێکی گەورە بووبێ

سەرەنگرێ کردن- دووچار کردنی یەکێك بە چورتمێك

سەروشك- بێ عەقل

خوێنی مێردی خۆی لەو دامێن تەڕو سەروشكو نامەردە بکاتەوە

شەرەف ل٣٥٦

سەر هێنانو بردن- لێکدانەوەی ورد

"... هەرچەندە سەری دەهێناو دەبردو لە دڵەوە لێکی دەدایەوە نەی دەزانی..."

بۆرە ل٦١

سەر هەڵگرتن- ڕۆیینو بەجێ هێشتنی شوێنێك، ئاوارە بوون

سەفاو مەروا- زۆر هاتنو چوونی یەکێك بۆ شوێنێك

سەگ- مرۆی بەدفەڕو بێ کارو فێڵباز

سەگ- لەڕووی سووکیەوە بە گزیرو خزمەت کار دەگوترێ

عەولا سەگی بەردەرگای ئاغای بوو

سەگ- (١) بێ نرخ، (٢) هیچوپوچ

خەرجی سەگەکەت مووچەی منە

سەگانی- بەشتی خەراپ دەڵێن

سەعاتێکی سەگانی کڕی

سەگایەتی- فێڵبازو ناراستی

بەسەگایەتی دەگریت

سەگ بە پیستەوە قوتدان- لە هیچ شتێ نەپرسینەوەو هەموو شت خواردن- حەرام خواردن

سەگ بە حەسار، سەگ بەحەوش- هێنانو بردنی بێ فایدە

سەگ تێ بەردان- ریسوا کردنو دەرکردنی کەسێ

سەگ بەحاڵت نەبێ- حاڵ ناخۆش- توشی بەڵاهاتووی بێ چارەسەر

له قونی سه‌گ نان- ریسواو ره‌زیل کردن

ده‌ردی سه‌ی- زۆر به‌زه‌حمه‌ت

سه‌گی به‌ر ده‌رکان- یه‌کی هه‌مووده‌م به‌دوای که‌سێکه‌وه بێت بۆ سوودی تایبه‌تی خۆی

سه‌ی له‌سه‌ی به‌رده- پیاوی هیچ‌و پیچ به‌گژ پیاوی هیچ‌و پیچ وه‌نێ

سه‌گی گلاو- به‌که‌سێ زۆر ئاکار خراپ ده‌ڵێن

سه‌گه مه‌رگی- هه‌جه مه‌رگی- کوله مه‌رگی- کۆله مه‌رگی- ژیانێکی ناخۆش‌و پڕ مه‌ینه‌ت‌و دوور له خۆشی

به‌سه‌گه مه‌رگی ده‌ژیت

سه‌گ تۆپ بوون- مردنی پیاوی به‌دفه‌ڕ

سه‌گ تۆپ کردن- کوشتنی پیاوی به‌دفه‌ڕ

سه‌گ وه‌ڕ- سه‌ره‌و- له ڕووی سوکیه‌وه به‌که‌سێ ده‌ڵێن که باسی که‌سێکی تر بکا به خه‌راپه

لێره‌وه سه‌ره‌وی بۆ مه‌به

سه‌گ وه‌ڕ- گاڵته‌جاری

سه‌گه- فێڵبازه

له‌و سه‌گه‌ی مه‌ترسی

سه‌گه سه‌گه- خۆ گێل کردن‌و خۆ به‌سته‌زمان نیشاندان

سه‌گی برسی- گزیرو خزمه‌ت کار تێرنه‌خۆر

سه‌گی پێ سووتاو، سه‌ی پێ سوتای- ماڵانگه‌ڕی هه‌دانه‌ده‌ر، که‌سێ که له هیچ شوێنێ ئارام نه‌گرێ

سه‌گی تێر- گزیرو خزمه‌تکاری ده‌وڵه‌مه‌ند

سه‌گی لێدراو- گزیرو خزمه‌ت کاری جه‌زره‌به‌دراو ئه‌زیه‌ت دراو

سه‌گێتی، سه‌گایه‌تی- فێڵبازی‌و زۆرزانی‌و به‌دایه‌تی

سه‌گی هار- سه‌ی هار- مرۆڤی شه‌ڕ فرۆش، که‌سێ هه‌موو ساتێك ته‌شقه‌له به خه‌ڵك بكات

ئازان وەکوو سەگی هار
دەخولێنەوە لەناو شار
هێمن ل٩٨
سەگی هار چل شەوی عومرە
پەند
سەگ تێ بەردان– واز لێ هێنان لە کارێ یا کەسێو بایەخ پێ نەدا، لەرووی سوکیەوە دەگوترێ
سەنگ– قەدرو حورمەت
پیاوی بەسەنگ
سەنگ لێنان– حورمەت نان لە یەکێك، رێز لێنان لە یەکێ، حورمەت گرتن
سەنگین، گران، مەند– مەردومی لەسەرخۆ بە حورمەت
سەنگو سوژن کردن– لێکۆڵینەوە لە کارێك زۆر بەوردی– شی کردنەوەی بابەتێك
سەنگی محەك– زۆر بە ووردی لە کەسێ گەیشتن
مامەڵەو سەفەر سەنگی محەکە
سەنگی محەکم بۆ چیە
بە بیلا کوردی بێ غەلو غەشم
سەنگەری شەرەف– بەرگری کردن لە کاری زۆر راستو پیرۆز
سەوزبوون– سەرگرتنی کارێك، بەهرەدانی کارێك
کارەکەی هێرۆ سەوز بوو
سەوز کردن– بنیات نانی شتێك، پێك هێنانی کار
شتێکم سەوز کردووە
سەی لە سەی– مرۆڤی زۆر بەدفەڕو بێ ئاکارو خراپەکار
سیرمە– زۆر لاواز
دانیشە سیرمە
سێ بەگایی– کاری ناڕاست

ئەو کارە سێ بەگایە بەمن ناکرێ
سێ و دوو- راڕا
سێ و دوو لێ کردن- لێی رارا بوون
سێ و دوو کردن- بەگومان لەکارێك
سێ و دوو نەکردن- بەلەز ئەنجامدانی کار
سێ و دووی لێ مەکە- گومانت نەبێ، لێکدانەوەی ناوێ
سیحرباز- بە ژنی فێڵبازی گەریدە دەڵێن
سیخور- شۆفار، جاسوس
سێزدە- دمۆر، نیگبەت، شوم
نێوچەوانم سێزدەیە
سیسە پەست- چورچە پەست، نەمانی هێزی گان کردن
سیسە مار- مرۆی دەبنەوە بڕ
سینەما- بەمرۆی قسەخۆش و گاڵتەجاڕ دەڵێن

## "ش"

شا- خۆزی بە

شا بەحاڵت نەبێ

شا- گرنگ

(شا باڵی دوژمن شکا( شا ڕێگایە ئەو ڕێیە)

شاباز- بەمرۆی ئازاو جەربەزە دەڵێن

شابەندەر- بێ شەرمو زۆر بلێ

شاپ دان- دەرکردنی یەکێ لە شوێنێ بە ڕیسوایی

شاپدار- دەرکرا

شاخدار، شاخ هاتی، قۆچ هاتی، شاخ شکای- دەویت، گەواد

شاخ دەرهاتی- ئابڕو نەمان، خەجاڵەت بوون

شاخ شکاندن- ڕیسوا کردنی پیاوی گەواد

شازادە- لاوی ئاکار باش، بەخشندە

شاگرد، قوتابی- ئەو کەسەی لەبەر دەستی کەسێ یا لە قوتابخانەیەکی پەروەردەی ژیانفێری دابو دەستووری ژیان دەکرێت

شاگەردانی، پاشا گەردانی- دونیای بێ قانوون پڕ ئاژاوە، هەرکەس هەرکەس

شامی شەریف- ئاسوودەو هێمنو بێ ئاژاوە

ئەو کات دنیامان بۆ دەبێتە شامی شەریف

بۆرە ل٢٦

شان بەقوڕ- ڕەنجدەر، زەحمەت کێش، هەژار

کابرایەکی شان بەقوڕم

شان تەکاندن- شان پاك کردنەوە، مەرایی کردن- ماستاو سارد کردنەوە

شان تەکێن- مەرایی کەر

شان دانەبەر- بەرعودە بوون لە کارێکاو یارمەتی دان، وەخۆگرتن

شان لەشانی دان- کەسێ بیەوێ رکەبەری لەگە یەکێ بکات

كه هاوتاى خۆى نەبێ

شان نەدانە بەر، شان خاڵى كردن– يەكێ كە فەرمانێكى پێ بسپێرن لێى دوور بكەوێتەوەو جێبەجێى نەكات

شايى بەخۆ بوون– بەحاڵى خۆ كەيف ساز بوون

شان داخستن، شان داهشتن– تەسليم بوون

شان دادان– مردنى يەكێك لە ڕووى سووكيەوە دەگوترێ

شتن، شتنەوە، شوشتنەوە– جنێودانى زۆر بەيەكێك– سەركۆنەو جنێو پێدان وردو درشت لێى دەردەبوون‌و بە قسەى نابەجێ زۆر پۆختە دەيان شوشتەوە

غەوارە– ل١٧٥

شرتوشۆ لێ برين، شرتوشۆ دەرێنان– بەجوێن ئابڕو بردن، جنێودانى زۆر بەيەكێك

شرپۆش– هەژارو نەدار

شڕكردن– جنێودانى زۆر بەيەكێك

شڕو دڕ– مرۆى بێ حەياو زمان پيس

شوێن پێ هەڵگرتن– پەيڕەو كردنى عادەت‌و نەريەتى كەسێ‌و لاسايى كردنەوەى

شڤان، شوان– خاوەن– سەرۆك– ئاگادارى لە قەومى خۆ

ئەم ميللەتە بێ شوانە

شوانيت پێ ناكرێ بۆ شوانى دەكەى

شوانى ناپاك– كاربەدەستى پايەبەرز كە تەنها بير لە بەرژەوەندى خۆى بكاتەوە ، هەر بۆ سوودى خۆى هەوڵ بدات

شوانە وێلە– نەخوێندەوار

شكان– ريسوا بوون

مرۆ بەدرۆ كردن دەشكێ

شكان– راكردن لەشەڕ

پاش شەڕێکی سێ سەعاتی دوژمن شکا

ئەگەر شاش بشکێ ئابروی شاو ئێرانیش دەتکێ

شەرەف ل٢١٣

شکان- هاتنە خوارەوەی نرخی شت

شەکر ئەمڕۆ شکا

شکان- لە قەدرو حورمەت کەوتن

شکاندن- دوژمن بەزاندن لە مەیدانی جەنگ، راونانی دوژمن

شکاندن- هێنانە خوارەوەی نرخی شت، هەرزان کردنی نرخ

شکاندن- ریسوا کردنی یەکێك

شکاندن- پاشگەز بوونەوە لە بەڵێن

وەرە مەشکێنە پەیمان          رۆژێ دێ پەشیمانی

شکاندنەوە- خەجاڵەت کردن

شکانەوە- خەجاڵەت بوون

شکاو- لەشکری راکردوو

شکاو- هەرزان بوگ

شل- یەکێ سور نەبێ لەسەر مەبەست

شلی لە کارەکەت

شلکردن- بەرڵا کردنی منداڵ

شلکردن- لەمشت و مڕدا نەرم و نیانی نیشاندان

شل نەکەی لەبۆی

شلکردنەوە- لە تورەیی خاو بوونەوە

شەرواڵ پیس- کەسێ بەدوای ژنان بگرێت

شەش تەقەل و مانگەشەو- کاری ناڕێك و پێك و بێ تەرتیب

شەلەو قولە- قەلەو قوتە- گەجەرو گوجەر

گزیرو خزمەتکاری بەدفەڕ

شلكوتی مەرگ- داركاری زۆر سەخت، لێدانی زۆر لە یەكێك

شوستوشۆدان، شوستو شۆ دەرێنان- جنێو پێدانی سووك كردن

شەختە- زۆر سارد

ئاوەكە دەڵێی شەختەیە

شەڕە پشیلە- نوسی و نوسراوی ناڕێك نوسراو كە نەخوێندرێتەوە

شەڕە دەنووك- شەڕە دەنوك- بەپۆڵەو پرتە بەگژیەك راچون

شەڕە سەگ- نەبونی قانون و هەراو هۆریاو هەركەس بۆخۆی

شەرم- ناو گەلی ژن

شەرمت داپۆشە

شەقاوی بەخوڕی ناوێی- هەڵە نەكەیت لە كردەو كاردا

شەق بردن- توڕەبوونی زۆر

لەداخی تۆ شەقم برد

شەق بردن- ئیرەیی بە ماڵی خەڵك بردن

شەریف- مرۆی خاوەن هەڵوێست و بێ عەیب

ئینسانی شەریف زۆرە

شەقڵشقاندن- حەیا بردنی یەكێك و شكاندنی لەناو مەردوما، ئابڕو بردن

شەقەی باڵ- فڕینی بەپەلەی باڵدار

كەوتەخۆی دای لەشەقەی باڵ دیسا

هەژار

شەكری لەزاری دێتە دەر- قسەی خۆش دەكات

شەكرت خوارد- (١) قسەكەت وانیە

(٢) بە هەڵەدا چووی

شەكرە سێو- زۆر شیرین

ئەم دەم و لێوە شەكرە سێو

شەكر- مرۆی لەسەرخۆ، راوێژ خۆش لەكاری رۆژانە لەگەڵ خەڵك

شەکر خواردن- قسەی باش کردن
شەکر شکێن- کەسێ گفتو لفتی خۆشەو هێمنو لەسەر خۆیە
شەکر شکاندن- لە ڕووی خۆشەویستیەوە دەگوترێ واتە قسەیەکمان بۆ بکە
شەکرەکی بشکێنە
شەکر لیف، شەکر لێو- گفتو لفت خۆش، قسە شیرین
شەکرە پیاو- پیاوی بە ئاکارو بێ عەیب
شەکرە ژن- ژنی باشو بەحورمەت
شەکی- مرۆیەك کە جلکی نالەبار بێ
شەمبون، چەموش- مرۆی جینگزو نەگونجاو لەناو خەڵك
شمشێر کرۆژ- پیاوی ئازا لەشەڕ
شەنو کەو کردن- لێکۆڵینەوە، لێ توێژینەوە
شەولەبان- سەگی پاسەوانی ماڵ
شەیتان- شوفارو ئاژاوەچی، نێوان تێکدەر
شەیتان- زرنگی فێڵباز
شەوە زەنگ- باری ناهەموارو ناخۆش
لەو شەوە زەنگە رزگاربام
شێرە بەفرینە- مرۆی ترسنۆکی خۆرانەگر بەرامبەر بەتەنگو چەڵەمە
شێر بەگوێ گرتن- بەمرۆی زۆر ئازا دەڵێن- رەشید
شیرازە تێکچوون- ئاژاوە، پشێوی لە ئارادا نەمان
شێرە ژن- ژنی ئازاو بەجەوهەر
ئەو شێرە ژنە پلانی خۆی لەلای هەندێك لە نۆکەرانی پازپوشو ئەمگداری
صالح بەگ درکاند
شەرەف ل٣٥٦
شێرە شێر- ئازایە ئازا
شەیتانی- بیرو کاری خراپ

شێرا- شێر- پیاوی ئازاو بەجەرگ
شێرانە- ئازانە، ئازایانە
شێردڕ- مرۆی ئازاو رەشید
کوڕ گەلی بەهێزو گوڕو شێردڕ لەبۆسە دەرپەڕین
شەرەف ل٣٥٧
شێرو ڕێوی بۆ هێنانەوە- فرو فێڵ بەکارهێنان
دەگەل برای بێ بەزەیی گوتی و رستی و شێرو ڕێوی بۆ هێناوە بەهرەی نەدا
شەرەف ل٦٨٣
شیربۆدان- قازانج کردن لەکڕینی ئاژەڵی
شێری بریندار- مرۆی ئازای زیان وێکەوتو
شیرپاك- مرۆی چاك و پاك و بێ گزی
ئێمەش بۆتۆ نان خۆرێکی چاك و چاکە لە چاو شیرپاك بوین
شەرەف ل٧٠١
شیر کێشان- خۆ ئامادە کردن بۆ تێو چوونی جەنگ
هێمن بەرامبەر بە دوژمن شیری کێشا
شیر لێ سوینەوە- هەڕەشە لەیەکتری کردن
شیر وەشێن- مەردومی ئازای دەست وەشێن
شیری خوا- قورئان
" بەخوا بۆ باوکی منیش دەست ناکێشتە شیری خوا"
بلە- کوێرەوەری ل٥
شیرین- (١) شتێك کەم دەست بکەوێ، (٢) مرۆی زۆر باش، بێ عەیب
شیرین- جوان، لاوی قۆز
ئەوەندە ڕۆڵەی شیرین لەم سەر زەمینە کوژران
یاداشت ل٥
شیرین- خۆشەویست

شیرین هەتاکەی دووریت بچێژم

شیرین بوون- خۆشەویست بوونی یەکێك لای یەکێك

شیرین زبان- مەردومی راوێژ خۆش

شیش لێدان- زەرەرو زیان بەیەکێ گەیاندنو بەهۆی هەڵفریواندنی

شیشەکم لێدا

شێت کردن- کەسێ کە یەکێ تورە دەکات

شێت بوون- تورە بوون

شێتخانە- نەبوونی یاساو هەرکەس بۆ خۆی لە شوێنێك

# " ع "

عاجوج و باجوج– هەزار زیلە، خەڵکی زۆری تێکەڵ و پێکەڵ

عار– ناو گەڵ

عەیب و عارت داپۆشە

عارەبانە– بە ماشینی خەراپ دەڵێن کە باش نەڕوات بە ڕێگادا

عارەبانەت راکێشە– لە ڕووی سوکیەوە بە یەکێ دەڵێن کە لە شوێنی دەربکرێت

بڕۆ واز بێنەو عاربانەت راکێشە

عادی– کەسێ لەبەر کاری ناڕەوا خۆشەویست نەبێ لە نێو خەڵکدا

کابرایەکی عادیە

عارەقە– رەنج و ماندوو بوون

بە عارەقە پەیدام کردووە

عارەقە پێ کردن– تەریق کردنەوەی یەکێك

عارەقە کردن– تەریق بوونەوە

عارەقە ڕشتن– ڕەنج، ماندوو بوون

عاشیرەت– بەشتی باش دەڵێن

عامود ژماردن، جادە پێوان– بەبێ کار سوڕانەوە لە شاران

عەبا لە عەبا خشان– تووش و بەرەنگار بوونی بەڵا لە گەڵ کەسی فێڵبازو شەڕفرۆش

عەجەمی– خەشیم، نەزان

بڕۆ هەی عەجەمی

عەبد– کەسێ بچەوسێتەوە نەتوانێ داوای مافی خۆی بکات ، هەموو ئازادیەکی لێ زەوت بکرێت

عەدەب، ئەدەب– ناو گەڵ

عەدەبت داپۆشە

عەمر درێژ نەبوون- کەسێ بەردەوام نەبێ لەسەر کارێکەو زوو وازی لێ بهێنێ

عەمرەکەم- ئازیزەکەم، ووشەیەکە بۆ خۆشەویستی بەکاردێ

عەمرەکەم ئۆف چاوەکەم سەنتەنە

فۆلکلۆر

عەلۆ جەلۆ- رەجاڵە- رووتەو پووتە، مەردومی هیچو پەچ

عەلە شیش- هێرو نەزان

عەنتەر- زۆردار

بەعەنتەری دەکا

عەنتەری کردن- زۆرداری کردن

عیفریت- ژنی بێ شەرمی هارو هاج دەڵێن

عیزرایل، دیوزمە- (١) ئەو کەسەی خەڵك لێی دەترسێن

(٢) ئەو کەسەی لەبەر دلی کەسێ یا کەسانێ ناخۆشەویستو درێو بێ

بویتە عیزایل بەرامبەرم

عەقڵ لە چوکی- کەسی درێژی بێ عەقڵ

عەقڵ لەکۆشی- بە ژنی بێ عەقڵ دەڵێن

عەمر نەمای- بێ کەڵكو بێ سوود، لەکار کەوتوو

عەمەل سست- تەمەڵو کارنەکەر

## " ف "

فاق دان- لاواز بوون

فاق دانانەوە، تەڵە دانانەوە، داو دانانەوە، تۆڕ دانانەوە- پیلان گێران بۆ تووشی بەڵا کردنی کەسێ

فاق، داو، تۆڕ، تەپکە، تەڵە- بەگژی گرتن

ئاسۆ بە فاقی‌وە بوو

خان بە تەپکەی وەبو

فرچك پیوەگرتن، دەق پێوە گرتن- کەسێ واز لە کارێ نەهێنێ هەر بەردەوام بێت لەسەری بەڵام ئەو کارە لەناو کۆمەڵ پەسەند نەبێت

فرشتە- پیاوی چاك‌و بێ ئازار

فریشتە- زۆر جوان، زۆر خوێشك

فڕفرۆك- گاڵتە بە یەکێ کردن‌و هەراسان کردنی

کابرای کردە فڕفڕۆك

فرمێسك- خەم‌و خەفەت

تاکەی فرمێسك بڕێژین

فرمێسکە بزە- گریانی شادی

فرمێسك‌و خوێن- خەم‌و خەفەت‌و کوشتن‌و بڕین

فرمێسك ووشك بوون- بەزەیی نەمان

فرمێسکی نەهاتە خوار- نەگریان

فرمێسکی لە چاوی نەبڕاوە- واتە بە بەردەوامی گریان

فرمێسك باراندن- زۆر گریان

فڕین- هەڵاتنی زۆر خێرا

منداڵەکە فڕی

فڕین- نرخی شت گران بوون

برنج یەکجاری فڕی

فزە لێ بڕین– لە جووڵە خستنی یەکێك

فزە نەکردن– لە ترسان قسە نەکردن

فس خواردنەوە– دەست نەکردنەوە لە بەرامبەر کەسێ

فسدان– دەرکردنی یەکێك

نەوزادم فسدا

فسدانەوە– واز هێنان‌و پەشیمان بوونەوە لەکارێك، ناچار پەشیمان کردنەوە

فس رووت– بودەلەو لەخۆ بایی

فسفس پاڵەوان– یەکێك کە هیچی لەبارا نەبێ‌و کەچی هەر خۆشی هەڵبکێشێ، خۆ هەڵکێشی هیچ لەدەست نەهاتگ

فسکەن– ترکەن– خوێڕی‌و ترسنۆك

فسنان– دەرنان بە سوکایەتی

فسنۆك، فستۆقی، فسکەن، ترکەن– خوێڕی‌و ترسنۆك

فسۆس– خوێڕی بێ کارە

فسەك– بێ غیرەت‌و نەوێر

فشبون– تەسلیم بوون، نەرم بوون‌و هاتنە باری یەکێك لە کارێکا کە لەوە پێش نەی ویستبێ بیکا

فشکردن– نەرم بوون‌و هاتنە بەریار بۆ کردنی کارێك خۆ بەدەستەوە دان

فشە فش کردن– خۆ هەڵکێشان

فشە فشی مەکە

فوتوی نەرم– قسەی خۆش

مار بە فوتوی نەرم لەکون دێتە دەر

فوو تێکردن– هەڵخراندن‌و بە قسە فریودان

لەسەرەنجامدا بە فوتێکردنی شەیتان‌و دنەدانی لەخۆبایی بوون هەوای پادشایەتی‌و سەربەخۆیی لە کەللەی‌دابوو

شەرەف ل٢١٠

فوودان- بەزندان لەشەڕی منالآنەدا

فووکردن- پێ هەڵگوتنی بەدرۆ

فوو لەئاگر کردن- ئاژاوە خۆش کردن

فوو لە دۆ نەکردن- بێ ڕامان کارێ کردن، بێ لێکدانەوە کارێ کردن

فەتیرە- مچ و مۆر

هەموو دەم دەمو چاوی فەتیرە

فەحل- کەڵ- مرۆی ئازاو بەکار

فەراش- لەرووی سوکیەوە بەکەسێ ئەگوترێ- نۆکەر- پیاو

سمکۆی شکاك بە جەمیلاغەی گوت، بڕۆ هەی فەراشی ئینگلیز

فەراق لێ بڕین- کوشتن

فیتە- بەر هەڵدای خوێڕی

فیتەی حەرامزادەیی- کاروکرداری نابەجێ و ناڕەوا

فیتەی حەرامزادەیی دیارە

فیرعەون- ستەمگەر، زاڵم

ئاغای رحمانی کاتی خۆی فیرعەون بوو

فێرگە، قوتابخانە- مرۆی زۆر زیرەك و بەئاوەزو لێزان لە هەموو بارێکی ژیاندا

گۆران فێرگەی شیعر بوو

فیکەی سمێڵ، فیسکەی سمیڵ- زۆر کەیف سازی، یەکجار کەیف خۆش

هەر فیکەی سمێڵی دێ

زۆرم دڵ خۆش بوو کەوا وا بە هاسانی لەو خەتەرە رزگاربووم هەروا فیکەی سمێڵانم دەهات

گێلە ل١٤٨

فیل- (١) ئازا لەکار کردن، (٢) ئازا لەشەڕ

فیلە تەن- (١) مرۆی زەبەلاح، (٢) ئازا لەکار

## " ڤ "

ڤا- شڵەژان، راچەنین

ڤابران

ڤال- بریتیە لە مرۆی دەم گەورە

ڤالە- بێ کار

ڤەبرین- قەرارو بڕیاری یەکجاری

ڤەپێچاندن- لێپرسینەوەو بەسەر کردنەوە

ڤەتەمران- مردنی کەسێ

ڤەجویە- دووپات کردنەوەی قسە چەند جارێك

ڤەخوراندن- قسەی خۆش‌و هێمنی دەگەڵ کەسێ رەفتار کردن

ڤەرشاندن- پێ بژاردن

# " ق "

قاپ شۆ- قاپ شۆر- کارەکەرو قەرەواش، تەیان

قاپگر- مرۆی بەد فەڕ

قاپگرتن- بەگژا چوونی یەکێك بە یەکێك دا بە ناڕەوا، کێشی تێ هاڵاندنی بە خۆڕایی

قاپی گیراو- ئەو کەسەی بە خۆڕایی توشی بەڵا بوە

قاڕون- مرۆی زۆر دەوڵەمەند

کابرا وەك ئاڕون و قاڕون وایە

قاز- گێل، بێ عەقڵ

قاف، کێوی قافی، چیای قافی، قولەی قافێ- شوێن و جێگای زۆر دوور

تۆ لە قاف نی کاڵەی ئاسینت بۆ هەلبەستم

تاریك روون

قاف قلۆر- نەزان، حەپۆلی کەم فام، بێ مێشك

قاقڕ- ڕەزیل، بنیادەمی رژد

قامچی- خورتی و بەزۆر

ئازاد بە قامچی نەبێ کارناکات

قاوەی یەکتر ناخۆینەوە- بەدووکەس دەوترێ کە یەکتریان خۆش نەوێت و قسەی لەگەڵ یەك نەکەن

قلْپ بوونەوە- لە بن چوون و نەمان

قڵیشاوەتەوە، تەقیتەوە- سەرەتای دروست بوونی کێشەو هەرا

لە سلێمانی قڵیشاوەتەوە

قنگ، قون- دواوەی هەموو شتێك

قونی ماشێنی ڕێی کەوت

قنگ خوران- حیزبوون

قنگ خوراندن- ئیشتیا له کردنی کارێك نەبوون، حەز کردن لە کارێکی نەبوو

قنگدانەوە- ڕۆنیشتن، دانیشتنێکی کەم

دەوەرە قنگی بدەوە با ئیسراحەت کەی

قنگ لێ کەوتوو، قون کەتی- مرۆی بێ هۆش گۆش کە هەمیشە شتی لێ بکەوێ، مرۆی شل‌و شەوێق‌و ئاگا لە خۆنا

قنگە جنۆکە، قنگە جن- شوێنی تەنگەبەر، شوێنی تەسك‌و تروسك‌و تەنگەبەر

قنگە قنگ- قونە قون- خۆدزینەوە لەکار، دواخستنی کار بۆ نەکردنی

دلشاد لەم کارەدا قنگە قنگ ئەکات

قۆپیە- شوێن‌و ڕێگای کە خۆڵ‌و بەرد نەبێ ئاووسیان بێ لەنێو شاخ- قوراوی کۆبۆوەی ناو شاخ

قوتابی- ئەو کەسەی لە کارێکا یا لە ڕۆژگارێکا فێرە ئەزموون دەبێ

من قوتابی ڕۆژگاری ڕەشم

قۆجە دەمۆڵ- پیرەژنی حەز لە جل‌و بەرگی جوان بکاو جل‌و بەرگی جوان لەبەرکا

قوچ ڕەو- بە مرۆی بەفیزو ناتێگەیشتوو دەڵێن

قوچ ڕەوی کردن- مرۆی ناتێگەیشتوو کاتی فیزی خۆی بەدەردێنێت

قۆچ هاتی- دەویت

قۆتر- مرۆی بێ کەڵك‌و کار لەدەست نەهاتوو

قۆڕ- قسەو کاری بێ تام

قوڕ بەچاو- خەفەتبار، خەمبار

قوڕ بەچاوی کردن، قوڕ نانە چاو- داخ‌و خەفەت کردن بەدڵی یەکێکا

قوڕ بەسەر- قوڕ وەسەر- لێقەوماوێکی بەستەزمان، کلۆڵ، بەدبەخت

قوڕ بەسەر لەچنگم قوتار نابیت ئەگەر بچیتە قولەی قافیش دەتبینمەوە

بۆرە ل٤٤

قوڕ بەسەر بوون- تووشی بەلا بوون، کەسی کەتووشی چورتمێك دەبێ

قوڕ بەسەر کردن– تووشی بەڵا کردن، کەسێك کە کەسێکیتر تووشی بەڵایەك دەکات

قوڕبەسەری– کلۆڵی، بەدبەختی

ئەو منداڵانەی بەقوڕ بەسەری بەخێوکرد

قوڕ بەسەری خۆکردن– خۆ تووشی زەرەرو زیان کردن

قوڕی لۆ گیراوەتەوە– تووشی بەڵایەکی گەورە دەبێ

قوڕی لۆ گرتەوە– تووشی بەڵایەکی گەورەی کرد

قوڕی بۆ دەگرمەوە– تووشی بەڵایەکی گەورەی دەکەم

قوڕ بۆگرتنەوە– تووشی بەڵای گەورە کردن

قوڕ بەدەو دادان– کاتێك یەکێ لەمشتو مڕدا نەتوانێ وەڵام بداتەوە

قوڕی بە دەویدا درایە– ناتوانێ قسان بکات

قوڕ پێوان– هاوارو داد لەدەست کەسێك یا شتێك

قوڕ پێوەدان– دوامین دەرەجە گەیشتن– کۆتایی پلە

هێندەی قازانج کردووە قوڕی پێوەدا

قوڕ پێوەدان– بەیەکجاری وێران کردن، وێران کردن یا تێکدانی شتێك

قوڕنانە سەر چاو، قوڕ بەسەر چاو کردن– داخو خەفەت کردن بەدڵی کەسێ

قوڕی بن دەرهێنان– هەموو شتێك ئاشکرا کردن

قۆرت– بەرگر، لەمپەر

قۆرتمان بۆ دروست دەکات

قۆرت– بەڵاو چورتم

فەقیری خۆشە قورتی ناخۆشە

قۆرت تێ خستن– بەرگرو لەمپەر خستنە بەر کاروبار

قۆرت تێ کەوتن– بەرگر هاتنە پێش کاروبار

قۆرتم– بەسەرهاتی ناخۆش، چورتم

قۆرتم هاتە پێشی

قورس– لەسەرخۆ بەحورمەت

قورس و قەمەر– مەردومی بەحورمەت

قوڕ شێلان– توشی بەلاو سەخلەت بوون

قوڕگ دراو– چەناباز، مەردومی دەنگ زلی چەنەباز

قوڕگ دڕاو– زۆر خۆر، مەردومی چلسی زۆرخۆر

قورگ گرتن– بەرەنگار بوون

قورگی گرتیمە– وازم لێ ناهێنێ

قورمیش کردن– دنەدان، هاندان

قوزە چیل– (١) شتی بێ نرخ و بێ سوود

(٢) مرۆڤی بێ کەڵك

قوزپان– مەرایی کەر، ماستاوچی، مەدەلایی کردن

قوزملاك– کارێك بەزەحمەت کەوتبێ و چارەسەری نەبێ

قوزە قورت– بە مرۆی جینگزو خەراپ دەڵێن

قوزکەش، قوزکێش– پیاوی زمان لوسی مەرایی کەری دووڕوو

قوز کێشی کردن– مەرایی کردن

قوزە کەمتیار– هۆی فریودان و هەڵخەڵەتاندن

قوزێ– پیاوی ئاکار ژنانە

قوزۆ– بێ غیرەت

قۆڵ بڕ– فێڵباز، ساختەچی، فریودەر

قۆڵ بڕین– لە خشتەبردن، فریودان

قۆڵ بڕی– فێڵبازی، گزی کەر

ئازاد بە قۆڵ بڕی دەژی

قۆڵ شکێن– فێڵباز، ساختەچی

قۆڵ شکاندن– ئەو کەسەی فێڵ لە خەڵك دەکات

قووڵ خوێندنەوە– زۆر بیر لێ کردنەوە

قوڵف لێ نان- سەنگین و گران راگرتنی یەکێك کە سەنگین و گران نەبێ

قۆڵ ماچ کردن، دەست ماچ کردن- تکاکردن ، پاڕانەوە

قۆڵ و باسك هەڵماڵین- خۆ ئامادە کردن و خۆسازدان بۆ ئەنجامدانی کارێك

ئەوجا قۆڵ و باسك هەڵماڵێت و تۆڵەی خۆی لە دڕندان بکاتەوە...

غەوارە ل١٣

قۆلنج هێنانەوە- لێدان و تەنگاو کردنی کەسێ

قۆڵە فیتنە- منالی زرنگ

قۆڵ هەڵکردن- سازو ئامادە بۆ ئەنجامدانی کارێك

قۆڵ هەڵماڵین- قۆڵ هەڵکردن

قۆڵیان لێ هەڵماڵی و ملیان نا لە پتەو کردنی سەنگەر

شەرەف ل١٤٩

قۆڵ هەڵمالاو- قۆڵ هەڵکراو، دەلنگ هەلپێچراو- ئامادە بۆ کار ڕاپەڕاندن

قۆندەرە ماچ کردن، پێڵاو ماچ کردن، کەوش ماچ کردن- زۆر پاڕانەوە لەکەسێ

قومارباز- فێڵباز

قومارباز‌ی- فێڵبازی

قوندەر- کەسێ لەبەر ئاکاری بەدفەرانە نەکەوێتە بەردڵان

قوونە قون- نەکردنی کارێك، پەژیوان بوونەوە

قوونە قوونیتی بڕوات

قون بادان، قوونە جوولە کردن- بڕوبیانو دۆزینەوە بۆ نەکردنی کارێك

سەید حمد زۆری بڕوو بەهانە داتاشی گەلێکی قونە جوڵەکرد

شەرەف ل٥٤٩

قوونپان- زەلامی تەمبەڵ

قوون تێکردن- زویر بوون لە کەسێ و گفتوگۆ لەگەڵی نەکردن

قوون تەندور- بێکاری و بە تەمبەڵی رابواردن

قوونجکە ژێر- ژنی کورتەباڵای جوان

قوون خوران- کاری ناشایستە کردن

قوون خڕ کردن- قەڵەو بوون لە تەمەڵیان

قوون خوار- هەمیشە نەخۆش

قوون دڕان- شورەیەو عەیب بۆ کەسێ مانەوە لە کارێکی نابەجێ ئەنجامدان

قوون دەهۆڵ- مرۆی سمت زەلام

قوون فرە- (١) ترسنۆك،(٢) تەوەزەل

قوون گران- (١) تەمەڵ، تەپ، (٢) مرۆی زۆر بەئەرك

قوون لە دەرێ- کەسی نهێنی خۆی نەپارێزێ هەموو کەس بزانێت

قوون لێ کەوتوو- کەسی کە پژدینو دەرپێی هەر دادەخزی

قوونە بان- ئاشنایەتی

قوونە بانم دەگەلی نیە

قەحپە دەرشێتەوە لە مزگەوت- کاتو ساتی ناخۆش کە پیاوی بودەلەو خوێڕی دێتە سەرکارو کاری ناجوامێرانە دەکات

قوونە جندا- جێگای تەنگو ترش

قوونە کەو- ئەزمونی زۆر دیتن

دنیام قوونە کەو کردووە

قوون هەڵپچڕای- کاری ناشایستە، کاری ناڕەوا

ئیشی قوون هەڵپچڕای مەکە

قەبز- وەرەز، تووڕە

بە قسەکەم قەبزبوو

قەپانجی- درۆزنی زل

قەپ داگرتن- تەماحی زۆر

قەحپە- بێ وەفاو بێ بەڵێن

برجوازی قەحپەیە

قەرن، قەرد– داهاتوو

بەقەرز ناترسم

قەرزار، قەردار– کەسێ لە رابردو غەدری لە خەڵك کردبێ

قەرەبروت– زۆر ووشك

قەرەج– ژن‌و پیاوی بێ داب‌و نەرێت

قەرەج‌و دۆم– خەڵکانی بێ داب‌و دەستور، خەڵکانی بێ رەوشت‌و بێ ئەدەب

قەرەجی– قەرەچناخی بێ ئابڕۆ

قەردار– کەسێ زوڵمی لە یەکێ کردبێ

قەرەقوش– حوکمی لاساری، سەربەخۆ حوکم کردن

قەرەو قوتە– فەقیرو هەژاری لادێ

قەساب– بێ ویژدان لە مامڵەدا

قەسابخانە– کوشتنی مرۆڤی بە کۆمەڵ

قەش– شوم

قەلاچ– غەشیم ، نەزان

قەلب، لەش– ناو گەڵ

قەلبت داپۆشە

قەلب خوران– حەز لێ بوون لەکاری ناڕەوا

قەلغانی هەژارو بێ دەسەڵاتان– پاڕانەوە ،. تکا کردن– لالانەوە

قەلب نەرم کردنەوە– زۆر لێدان لەکەسێ، دارکاری کردن

قەلب پیس– کەسی جماعی کردبێ

قەل– قسەزان

نەوزاد زۆر قەلە

قەل فڕ– چاو لێ کەری

قەڵا شوێنی کە مرۆ بپارێزێ

قەڵا گر، قەڵا شکێن– پیاوی میرخاس ئازا لەشەڕ

قەل‌و بەرد- دوژمن بە ترسنۆك دانان

قەڵەم- خوێندەوار

قەڵەمی هەیە- واتە خوێندەوارە

قەڵەمی- باریك‌و ڕێك‌و جوان

خەیاری قەڵەمی

قەڵەمی- قسەی خوێندەوارێك كە هەموو كەس تێ نەگا

قەڵەمی دەست‌و پێ شكان- تاسان بەهۆی كاری ترسناكەوە

كەلهۆكی كەوتە ناو شیوی شیوان‌و قەڵەمی دەست‌و پێی شكاو ڕایەل‌و پۆی...

شەرەف ل٧٢٠

قەڵەو بوون- دەوڵەمەند بوون

قەمیش- ئامرازی نێرینەی ئادەمیزاد كە ناوهێنانی بەبێ ئەدەبی دەزانرێ

قەوان- دەنگ‌وباسی هەڵبەستراو

ئەمە قەوانی ئەمڕۆیە

قەوچە- كەسێ قسەی خەلەت دەكا

لەقەوچەی داوەو نەیهێشت قسان بكات

قەوچە قەوچ- زۆر وەڕی- قسەكردنی زۆر بێ مانا

وەسا بەسیە قەوچە قەوچ

قەوچە كردن- قسەی بێ تام كردن

قەیم- ڕەزیل، چروك

بابت گەلەك قەیمە

قیرو بنێشت- یەكێ كە وازت لێ نەهێنێ

بویتە قیرو بنێشت وازم لێ ناهێنێ

قیبلە- خۆشەویست، ئازیز

قیبلەم تۆراوە ئاشتی نابێتۆ

**فۆلكلۆر**

**قیامەت- هەراو هوریای هەركەس هەركەس**

**قیامەت لێ هەستان- كەسێ تووشی ئاژاوەو ناخۆشی بێت كە چاوەڕوانی نەبووبێت**

**قیامەت هەستان- (١) خەڵكی زۆر كۆبوونەوەی لە شوێنێك**

**(٢) رۆژگاری ناخۆش‌و پڕ ئاژاوە كە كەس ئاگای لەكەس نەمێنێ‌و هەر كەس هەوڵی خۆی بدات**

" ك "

کا- (۱) هەرزانی نرخی کالایەك
(۲) شتی زۆر
برنج وەکو کایە لەبازاڕ
کابڕ- کەسێ کە کاروباری مەردوم بیڕێتەوە
کابگڕ-(۱) جنێو فرۆش، (۲) ئەو کەسەی پاش ملە قسە دەکات
کاربرا- هاوکاری
بەکار برایی تەواومان کرد
کارخانە- قەحپەخانە، جندەخانە
کارخانەچی- کەسێك کە خاوەنی قەحپەخانەیە، دەویت
کارتۆنی- داموو دەزگای بێ بڕیارو بێ بەرهەم
کاردو پەنیر- دوژمنایەتی دایمیو بێ بڕانەوەو نێوانی دوو دژ، دوو شت هەرگیز کۆنەبنەوە
کار لەکار ترازان- ڕووداوێك کە پاشگەز بوونەوەی تیانەبێ
کاروان کردن- زۆر هاتوچۆکردنی یەکێك بۆ شوێنێك
کاسە لەسەر شکان- سوچ باربوون، تاوان باربوون
کاسە لێس- مەردومی پاشماوەخۆر، بنیادەمی چەورەو چلێس
کاسە ووشك- رژد، قرچۆك
کافر- بێ ویژدان
ساوەرە رەحمێ بەحالم کە ئەگەر چی کافری
کوردی
کافرباب- زۆر بێ ویژدان
کافربون- زۆر توڕەبوون
لەتووڕەیان کافر بووم، کافرم مەکە: تورەم مەکە

کافر بەحاڵی نەبێ، دوژمن بەحاڵی نەبێ– کەسێ کە زۆر شپرزە بوبێ بەهۆی کارەساتێکەوە

کافر کردن– توورە کردن

کافری کردم

کافرستانی– شوێنێ کە بەزەیی تیانەبێ

کافری پێ موسڵمان دەبێ– یەکێ کە جێگای بەزەیی بێ لەلایەن هەموو کەسێکەوە

کاڤلاش– خانووی نەوی، بچوکی فەقیرانە

کاک– وشەی حورمەت بۆ پیاوان

کاکوبرا– نێوان خۆشی دوو کەس

"... چما دلگیری لە نێوان کاکو برایان هەیە..."

بۆرە ل٥٦

کاکو برا– ئەو کەسەی یارمەتیت دەدات لە تەنگانەدا

بۆ من بوونە کاکوبرا

کاکەو براله کردن– پیلان گێڕان

ئەوسا دەگەل مەلیك عادلی مامیدا کاکەو برالەی خۆیان کردو بەجوتە لەشکریان ئاژوت

شەرەف ل١٦٤

کای بێ دان– بێ کەڵك

کای بێ دان شەنکردن– کاری بێ هودە کردن، ماندوو بوونی بەلاش

کاله دڕانە– مزی ماندوو بوون– حەقی ماندوو بوون

سەرباریش دووسەد هەزار دیناریان کاڵە درانە بۆ ببڕێری

شەرەف ل١٥٧

کاوبا– بێ هێزو بەهێز

کاوێژکەر– کەسی زۆر قسان دووبارە دەکاتەوە

کاوێژ کردن– زۆر دووباره کردنەوەی قسەیەك

کای کۆن– باسی رابردوی لەدەس چووك

کای کۆن بەبا مەکە

کپ کردن– بێ دەنگ کردنی یەکێك

کپم کرد

کتك‌و مشك– دوو دژ کەبەهیچ جۆرێك کۆنەبنەوە

کچینی، کیژینی– کاتی خۆی

بەکچێنی بۆت نەکرد بە بێوەژنی هیچ ناکرێ

کرانەوە– بەقسەهاتن، وەرام دانەوە

کراوە لێی هەزار قسەی پێ گوت

کراوە– بەقسەو گفت‌و لفت

کابرایەکی کراوەیە

کردیە بوهار– خۆشی گوتن‌و بە کردەوە هیچ

کڕ کردن– کوشتنی کەسێ

کرم– بۆ کچی جوان دەڵێن

نازدار دەڵێی کرمە

کرمی کەوتیتێ– حەسودی پێ بردن

کرمن– بەمرۆی رکونی دەڵێن

کڕە کردن– منەت کێشان، سوپاس کردن

کڕینەوە– ڕزگارکردن لە چورتم

ئەو پاڵتۆیە ئەمساڵ منی کڕیەوە

کڕێوە بردو– بەفر لێ باریو– کەسێ زۆر بەسەرمایی قەڵسە

کز– مات‌و مەلول

سەرکزی دڵ وریا

پەند

کز دانیشتن– ئارامو بێ وەی

کزە لە جەرگەوە هاتن– خەم خواردن

ئێستاش کەوەبیرم دێتەوە کزەم لەجەرگی دێو خەمێکی گران دام دەگرێ

تاریك روون– ل٩

کزەی جەرگ– زۆر خۆشەویست

کسۆك– خەراپ، بێ قیمەت

بڕۆ هەی کسۆك

کفتەخۆر– تەمەڵی کارنەکەرو نەوسن

کفر– قسەیەك کە یەکێ لای ناخۆش بێ، هەڵە کردن

کفرم کرد وتم وەمەکە

کفر کردن– قسەیەك یەکێ بیکاتو کەسێکی تر لای ناخۆش بێت

کفن دڕین– لە نەخۆشی رزگاربوون

کلاش– بە مرۆی سوكو چروك دەڵێن

بڕۆ هەی کلاش

کلاش خوار– زەحمەت کێش، رەنجدەر

کلاو کردنە سەر– کلاو لەسەر نان

کلك– (١) خۆ لەکەسێ نزیك کردنەوە بۆ سوودی تایبەت

(٢) زیادە

کلکایەتی– کەسانی بێ هێز نزیك بوونەوە لە کەسانی بەهێز بۆ مەبەستی تایبەتی خۆی

کلك تێوەردان– لە ڕووی سوکیەوە بە یەکێ دەڵێن کاران تێك بدات

کلاوچی– فێڵبازو ساختەچی

کلاو لەسەر نان– هەڵخەڵەتاندن، فێڵ لێ کردن

کلاو لەسەر خەڵك نان– خەڵك فریودان

کلاو بۆ دورین– گان کردن لەپەنای کەسێ

کڵاوی بابردوو- کڵاوی بابردی- کاری نەبوو، کارێك هیچ ئەنجامی نەبێت

کلك بادان- ناچار کردن بە کارێك

کلکیم باداو کارەکەم پێ کرد

کلك بادان- بیانگە دیتنەوە بۆ نەکردنی کارێك

کلکانی- حۆڵ و کەم هۆش، مرۆی شێتوێت

ئازاد پیاوێکی کلکانیە

کلك بەس- کەسێك کە دەست شکێن کرابێ

کلك پێوە کردن- گاڵتەکردن بە یەکێك

کلك پێ هەڵپەساردن- خۆگێل کردن لە ئەنجامدانی کارێك

کلك تێدابوون- لەرووی سوکیەوە بەکەسێ دەڵێن بەشداربێ لە کارێکی ناڕەوادا

کلك رەپ کردن، کلك قیت کردنەوە- پاشگەزبوونەوە لە کارێك

کلك گرتن- خستنە ناچاریەوە

کلك وەبەر تەڵە کەوتن- تووشی بەڵا بوونی مرۆی بێ نرخ و بوودەڵە

کلك وەبەر تەڵەدان- تووشی بەڵا کردنی مرۆی فێڵباز

کلکە سووتە- کلکە سووتەکە- کلکە سووتەکێ- کلکە لەقێ- کلکە لەقە- کلکە قوتە- مەرایی و ریایی یەکێك بۆ یەکێك کردن، لە گامی کردن بۆ کەسێك

نووسەرێکی وایان دەویست کە بە پاروە بەرماوێك و چنکە دراوێك کلکە سوتەیان لەبەر بکات

شەرەف ل٦٦

کلکە قنگێ- جوولاندنی یەکێك بەکردار

کلك کردن- تەبا بوونی دوو کەس بەگزیەوە

کلکەمار- شتی زۆر تاڵ

کلکە لەقە، کلك جولاندن، کلك بادان- دژواری زۆر لە پێکهێنانی کار- کار وەزحمەت خستن

بەكلكە لەقی خەلاسم كرد

كلك یەك بوون– بەدوو كەس دەڵێن كە تەباو تفاق بن بەرامبەر بە كەسێكی تر بەفێڵ

كلك هەلسوراندن، كلك قیت كردنەوە، كلك رەپ كردن– بە رەنگار كردن‌و بەقسە نەكردن

كلكی لەقونی خۆی ناوە– تەریق بوونەوەی كەسێ كە كارێكی نا بەجێی ئەنجامدابێ‌و لێی ئاشكرا بووبێ

كلیلەی زار– یەكێ نەهێڵێ‌و مۆڵەت نەدا كەس قسان بكات

بوە بە كلیلەی زارم

كلیل بەدەست– مرۆی خاوەن توانا‌و بەئیختدار

كلیل دران– رەق بوونی دەم‌و قسە پێ نەكران

دەمی كلیل درا

كوتان– لێدانی زۆر

نەخوێنی دەت كوتم

كوتك‌و سینگ– كەسێ كە دەیەوێ بەزۆری قسەی خۆی بچەسپێنێ

كورسی لەق بوون– سەرەتای لە پلەو پایە هێنانە خوار

كورسی– پلەو پایە

كوچ كوچە– بەیەكێ دەڵێن كە لە زیادەوە لەگەڵت بێت لە كردەو كاردا

كوچ كوچەیە لەگەڵم

كوڕ– ئازاو بەجەوهەر، گەڕناس

"... دەی خەنجەر گیان بەخولامت بم...! ئەمڕۆ رۆژی میرانە دەست هەڵێنە، رۆژی كوڕانە

بزن‌و گورگ ل٣٨

كۆر، كوێر– نەزان

لەراست عەیبی خۆی كۆرەیە

کورت بین– بیر نەکردنەوە، هەڵەپڕۆ

کورتو کرمانجی– رەپو راست، زۆر بەکورتیو بەراستی

کوردانە– ئازایەتی، بەغیرەتی

کورم شکەستیت– تۆڵە سەندنەوە، کوڵی دڵ رژاندن

کورە باڤ– پیاوی ئازاو نەترس

کوڕە کوڕە– لاوانی بەهێزو ئازا

کوڕە کوڕەی مامەشان هاتنە مەیدان

کوڕانی– لاوانی ئازا

کوڕانی شۆڕش هەڵمەت بەرن

کۆزی ساویە– مناڵی وردە

کوڕی رۆژ– بەکەسانی هەلپەرست دەڵێن کە تەنها بیر لە سوودی خۆیان دەکەنەوە

کۆزرو بەربانان– لێدانی زۆر

کوزکەش– مەردومی گەواد

کوزە کەمتیار– کەرەستەی فریودان

وەك کوزە کەمتیاری پێ بێ ساعەتەن لای دام لەڕێ

کوردی

کۆزو شەش– زۆر باش

بۆ گیاندارەکان کۆزو شەش بوو کەدوڕگۆکەیان لە دڕندان پاك بکرێتەوە

بۆرە ل١٦

کوژاندنەوە– نەهێشتنی هەراو ئاژاوە

کوژراو– یەکێك کە زۆری لێ درابێ

کۆسپ– بەرگری لەژیان تووشت دەبێ

بەهۆی کۆسپی دژوارو روداوی نالەبارو لارگەرانی رۆژگاری ناهەموار...

شەرەف ل١٢

کۆسپ بڕین- رزگاربون له ئاژاوەو گێچەڵ

کۆستکەوتن- بەدبەخت بوون

کۆستکەوتو- لێقەوماو

کۆسه کۆسانی- هێنان و بردنی یەکێ بەیەکێ بەفێڵ- به فێڵ یەکێ بهێنی و ببەی

کۆسه کۆسانیم پێ مەکه

کۆسەجی- ئازا له شەڕدا

کوسەك- خوێڕی، هیچ و پوچ

کوسکەش، کوسکێش، قوزکێش- (١) مەردومی گەواد

(٢) کەسێ که مەرایی بۆ یەکێ تر دەکات

پێویسته لەگەڵی زۆر خولق خۆش و بەسەویەت و نەرم بین و کوسکێشی زۆر لەبەر بکەین

بۆره ل٣٥

کۆش- شەرمی مێیینه، ناوگەڵی ئافرەت

کۆشت داپۆشه

کۆش- ژمارەیەکی زۆر

کۆشێك منالی هەیه

کوشتن- دارکاری کردنی خەست

کوشتن- تەریق کردنەوەی یەکێك زۆر بەتوندی

به قسەکەت کوشتت

کولان- زۆر توره بوون

زوو کولا

کولان- شارەزاو لێزان له کارێك

کۆلاو، کولاو، سوتاو- بەلەد، لێزان- زۆر شارەزا

کولاندنەوه- وەبیرهێنانەوەی رۆژی ناخۆش، وەبیر هێنانەوەی بەلای ناخۆش

ده برینم مەکولێنەوە
لانەوازان
کولدار- خەمبار، خەفەت بار
کوڵك- توش، دوچار
کوڵکم بوه بە کوڵکیەوە
کوڵکار- مرۆی رێك‌و پێك تەکوز
کولوکۆ دامردن- سووتان‌و لەناوچوون
کوڵە وەیباب، کۆرە وەی باب- مرۆی بەد فەڕو زیان بەخش
کون بەکون- زۆر بە وردی
کون بە کون لەدوو گەڕان- زۆر بەوردی لەدوو گەڕان
کون کردن- کچ کردنە ژن
کۆنە برین کولانەوە- وەبیر هێنانەوەی بەڵاو خەم‌و خەفەت‌و کەسەر
دایکی کلۆڵ‌و بەستە زمان کۆنە برینی کولانەوەو گەرمە شینی لێ ژیاوە...
شەرەف ل٧٢٣
کۆنە پۆش- پیاوی تەرکە دنیای خواخواز
کوێرانە- ڕەمەکی، نەشارەزا، نەزان
کوێرانە کار دەکات
کوندە بۆ- دمۆر ، بەد فەڕ
کوێر دڵ- نەفام، نەزان، ناتێگەیشتو
کوێر نان- رژد، رەزیل، چکوس- قرچۆك
کوویی، کێوی، کیوویی- هیچ نەزانی، لێ نەزان، نابەڵەد
کابرایەکی کوویی‌یە
کەبابە بوون- گەورە بوونی جووجەڵەی مریشك‌و قەلەموون‌و باڵندەی تر بە جۆرێك کە لەوانەبێ گۆشتەکەی وەك کەباب ببرژێنرێ‌و بخورێ
کەپوو بڵند- بەفیز، خالوور- غرور

کەپوو بڵند بوون– بەفیز بوون، غالوور بوون– بە دەعیە بوون

کەپوو بڵند کردن– بەفیز کردن، خالوور کردن

کەپوو خوار– عادز، زویر

کەپووی لێ خوار کردینە

کەپوو شکاندن– تەمبێ کردن، ترساندن

کەپوو شکاو– تەمبێ کراو، ترسێنراو

کەت– تووشی زەرەرو زیان بوو

کەر– دەبەنگ‌و نەفام، بێ عەقڵ

کەرانە– پارەێی کە پەشیمان لە سەودابە فرۆشیاری ئەدا تا لێی وەرگرێتەوە

کەرانە– گەوجانە، بێ عەقڵانە، گێلانە

... بەزەردە خەنەیەکەوە وتی:" کەرە نابینی ئیشم هەیە"

کەرە لووت– بلە ل۳۲

کەرە– بێ عەقڵە

کەرایەتی، کەریەتی– کاری ئەحمەقانە

کەربازار– بێ یاسا لە شارو دەوڵەتان، هەرکەس بۆ سوودی خۆی کار بکات، هاروهاچ، ناڕێکی لەنێو کۆمەڵدا کە گوێ بەهیچ یاسایەك نەدرێ

کەر بازاڕی– هاروهاجی، شوێنی بە ئاژاوەو هەرچی‌و پەرچی کەس ئاگای لەکەس نەبێ

لەو کەر بازاڕیە سەر دەرناکەم

کەربوون– سوربوون لەسەر کارو قسەی بێ بایەخ

کەربوون– توورە بوونی بێ ئاقڵانە

کەر بوون– کەسێ کە فریوی خواردبێ

کەرپێ گان– تووشی عەیب کردن، شورەیی بەسەر هێنان، کاری ناڕەوا پێ کردن

کەر کردن– لەخشتەبردن، هەڵفریواندن، هەڵخەڵەتاندن

کەرتڕ– چەنەبازی قسە بێ تام

کەرتڕێنە– مەردومی نەزان دوو و قسە ڕەق

کەرتڕێنە– سەربەرەو ژووری زۆر ڕژد، جێگای سەخت

هەورازی کەرتڕێنەی لەچیای شیشاری

کەرخەس– کاری هیچ و پووچی بێ فایدە

ئەوەی تۆ ئەی کەی کەر خەسە کار نیە

کەر خەسین– کەسێ کە کاری هیچ و پووچ دەکا

کەردن، سیرمەخۆر– دزی خوێڕیلە

کەرزك– مرۆی زۆر درۆزن

کەرسەگ– بە دیمەن گێل بەدڵ لەسەر هۆش

کەر شین– سەیدی بەدرۆ، کەسێ کە بەدرۆ خۆی کردبێ بەنەوەی پێغەمبەر

کەرگان– کاری ناشایستەو نالایەق کردن

کەر گان– خەجاڵەتی و شورەیی لە رووی سوکیەوە دەڵێن

کەرگانی بۆ ماوە

کەرگێ– لە ڕووی سوکیەوە بە یەکێ دەڵێن کە کاری لە دەست نەیێ، بێ دەسەڵاتی بەفیز

کەری ئەو بارەی نیمە– لە ڕووی سوکیەوە دەیڵێ کە توانای ئەو کارەی نەبێت

کەری گایە– عەیب و شوورەیی وەسەری‌خۆی هێنایە

کەرلەوەڕین– کەسێ کاری ناڕەواو بێ بایی دەکا

کەر مجینی– زۆر چەپەڵی و گەماری

کەرۆ– پیاوی بێ ئاوەز، پیاوی بێ عەقڵ

کەر وەستەك– هەورازی دژوارو سەخت و ناخۆش

کەروێشکە خەو– نووستنێك کە چاوت هێشتا نەقوچابێ، بۆ ڕژان

کەروێشك بە عارەبانە گرتن– توانای زۆر دەسەڵات بەهەموو شتی شکاندن

کەرو بارگیر، گۆلك و مانگا– بەخەڵکی بێ عەقڵ و نەزان دەگوترێ

ئاخر کەرو بارگیرینە، فرۆکە کەوتنو تەرم دۆزینەوە، بۆ ئەم شارە خیرو...
زەبووك ل١٦١
کەرە پیاو- زۆر ئازاو نەترسی بێ عەقل
کەرە پیاو- پیاوی بێ ئاوەزو کەم فام
کەرەواڵە- حۆلو کەم ئاوەز
کەری- بێ ئاوەزی
کابرا تە زۆر کەری
کەری دێزە- کەسێ خۆی زەرەردار بکات بۆ ئەوەی یەکێ تر زەرەردار بێت
کەسکین- پیاوی توند میزاج
کەشخەیی- فیزو دەعیە
کەشخەم لەسەر لێ مەدە
کەشكو دۆ- دووکەس کە لە خزمی دوور بن
ئازادو نەوزاد کەشكو دۆنە لەسەر یەك
کەعبە رووخا- قسەو کردەوەیەك یەکێ بیکاو یەکێتر پێی ناخۆش بێت
کەڵە بۆر- کەڵە کەوێت- ئازای هاروهاج، زیرەکی فێڵباز
کەڵە زەر- کەڵە زڕ، لاسار
کەڵە زەری، کەڵە زڕی- لاساری، کاری بەزۆریو ناچاری
کەڵەپیاو- میرخاس، ئازاو رەشید، عگید
نەجم الدین کەڵە پیاوێك بوو لە پیاوە هەڵبژاردەکانی جیهان
شەرەف ل١٢٨
کەڵە وەکێش، سەرکێش- لاسار، بەقسەنەکردن
دیارە نیازی شتێکی هەیە بۆیە وا کەڵە وەکێشم لەگەڵدا دەکا
کۆر ئۆغلو ل٧٤
کەڵە مێر- ئازاو رەشید- کەڵە مێرد
من میر یوسف بووم، ئازادو سەربەست کەڵەمێردان وەپێش خۆم دەدەم

کۆر ئۆغلو ل٧٢

کەفتن، کەوتن- کەتن- (١) بێ حورمەت بوون، (٢) نابووت بوون

کەف و کول- کینەو ڕق

کەڵ- ئازاو بەکار، نەترس لە دوژمن

کەڵ بژی ، کەم بژی

خاڵە شەهاب

کەللە ئەستور بوون- زویرو تووڕە بوون لەکەسێ کە کارێ یا کردەوەیی بەدفەڕا ئەنجامدا

کەللە با- سەرسەخت- کەللە ڕەق- کەللە شەق- لاسار

دیارە شارل کابرایەکی کەللە شەق و سەرە ڕۆ بوە

دادوەری ل٤١

کەللە بۆش- بێ ئاوەز، بێ ژیری

کەللە پوچ- (١) کەللە بۆش، (٢) کۆنە پەرست

کەللە زراو- مەردومی ترسنۆك

کەللە کلۆر- بێ عەقڵ، ئەحمەق

کەللە کۆن- کۆنە پەرست

کەللە گەرم- مرۆی تووڕەو تۆسن

کەلە بەر- دەرەتانی تەنگ، ڕزگاربوون بە دژواری

کەڵەکە تڕە، تڕە کەڵەك- (١) لەسەر یەك کەڵەکە کراوی لە ڕمان نزیك

(٢) کارێ کە ناشێ سەربگرێ

ئەو کارەی تۆ تڕە کەڵەکە سەرناگرێ

کەڵەکە کەوتنە عاردی- ئاسوودە بوون

کەلەکە نەکەوتنە عاردی- ئاسوودە نەبوون

کەڵەگا- مرۆی زۆر کەر- مرۆی زۆردار

کەڵەگایی- زۆری، ناهەقی، ئیستبدادو خود سەری

بەتاقی تەنێ کەڵەگایی لە خەڵك دەکرد..."

کەلەوەر ڕەشکردن- دزی کردن

کەلەوەری ئەو ماڵەی ڕەشکرد- واتە دزی لێ کرد

کەڵە هێڕ کردن- گەلە کۆمەکێ کردنی چەند کەسێك لە کەسێك، کۆبوونەوەی زۆر کەسی لەدژی تاکە کەسێك

کەم- بێ قیمەت- بێ نرخ- کەسێك لەبەر کاری نالایق نەچێتە دڵانەوە

کەم چیکڵدانە، بێ چیکڵدانە- مەردومی تورە، بێ سەبرو حەوسەڵە

کەمدەس- کەمدەست- (١) ڕژد، ڕەزیل، (٢) بێ توانا، هەژار

کەمڕوو- روتەنك- شەرمن، مەردومی شەرمن

کەمەر بەست، کەمەر بەستە- (١) بەندە، خزمەت کار

(٢) کەسێك کە ئامادەی فرمانێك بێت

کەمەر ووشك بوون- زۆر ترسان

کەوچك بەدەستی گەل- ژێر فەرمانی گەل

کەوگیر بەدەست- بەرپرس

کۆنە چاڵ- مرۆڤی قوندەر

کەمەندکێش- کەسێك کە ڕەوشتو خوی بەرزی هەبێ پیاوی خوا ناس بووبێ، عاشق بوونی شێخی تەریقەت

کەنار گرتن، کەنارگیر- دوور کەوتنەوە لە خەڵك

کەندوی بەتاڵ- مرۆڤی بێ ئاوەز، بێ ژیروبیر

کەوتنە چاڵ- تووشی بەلا بوون

کەوتنە خاكو پای- پاڕانەوە ، لالانەوە لە کەسێ

کەوش ماچ کردن- پاڕانەوە، تکا کردن، ناورانەوە

کەوین کەو- دوژمنی خۆ

کەو بەکەو گرتن- خەڵك گرتن بەهۆی کەسانی ناوخۆیان

کەوڵ بردنە دەباغخانەی- کوشتنی کەسێ زۆر بەناهەمواری

کەوڵ کردن- بەیدەستو زەبوونکردنی گیاندارێك، بێزار کردنی کەسێك

فەرهاد نەریمانی کەوڵکرد

کەوڵەکۆن- پیری پەککەوتە

کۆزو شەش- کارێك یا کردەوەیەکی باشو سوودی بۆ کەسێك تێدابێ

کێچ کەوتنە کەوڵ- ئارام لەبەر بڕان، پەلە پەل پێ کەوتنی یەکێك

کێچ هەڵێنان- وەپەلە کەوتن، پەلە پەل پێ کەوتنی یەکێك بۆ بەجێ هێشتنی شوێنێك

کێشکە پێ گرتن- تەنگاو کردنو ترساندنی کەسێك لە کارێك دا

کێشکە لەئاو نەکردن- زەرەرو زیان بۆ کەس نەبوون- مرۆی بێ زەڕ

کیرخۆر- ئافرەتی جۆشن

کیر ئەستور، کێر زل، کیر گەورە- زۆرکار، مەردومی زۆردار

کیری بێ گون- لەڕووی سوکیەوە بەیەکێ دەڵێن کە بێ کەس بێتو کەسی نەبێ

کیر ئەستوری، کێرزلی، کیرگەورەیی- زۆرکاری، ناهەقی، زۆرداری

کیر پێ نەچوون- کارێك لای کەسی گرنگ نەبێو خەمی بۆ نەخوا

کێرە فیل- قامچی هۆنراوە کە ئەکرێتە دەست

کیرگرتن- هیچ بۆ نەبوون

کیر مەخولانی- دەست گەمەو جوین دان لە نێوان ئەو کەسانەی بەیەکەوەن

کیر نیشاندان، کێر پێ شاندان- گاڵتە کردن لە وەڵام دانەوەی کارێك یا کردەوەیەك

کیژە قەرەجو خاتونی- کاری چاکو پیاوی بەدفەڕ نابێت

کێردو پەنیر- دوژمنایەتی دایمیو بێ بڕانەوەو نێوان دوو دژ، دوو شت هەرگیز کۆنەبنەوە

ئەنوەر بەگو شادێردی دوژمنی لە مێژینەی یەکتر وەك کێردو پەنیر وابوون

شەرەف ل١١٨

کێرد گەیشتنە سەر ئیسکان– زۆر تورە بوون‌و بێزاربوون لە کەسێ کە زۆر زوڵمت لێ بکات

کێوی، کیوی– نەزان، مەردومی سرکی سڵ کردوو لە شت

کیسە لە مل– کچی جوان لەماڵی باوکی

کیسە هەڵدروون– تەماداری یەکێك بۆ شتێك، بەهومێد بوون بۆ شتێ کە لە ئایندەدا بکات

نەوزاد کیسەی بۆ هەڵدرووە– واتە بەتەمایەتی

کیمیا– کاری زۆر بەسوودو قازانج

سنعات کیمیایە

## " گ "

گا– زل، قەبە، گەورە

گابەرد– بەردی زل

گا– زۆر خۆر

ئەو گایە بەمن تێر ناکرێت

گابۆر– شین‌و گریان بەدەنگی بەرز، گریانی چەند کەسێك بەدەنگی بەرز بەهۆی مردنی خۆشەویستێکیانەوە

بەرەو ئەستەمبوڵ خوشین‌و بەشین‌و گابۆرەوە رویان کردە ئاستانەی سوڵتان...

شەرەف ل٥٨

گاپێ– تەپ، تەمبەڵ لە ڕۆیشتندا

گاحۆل– زەلامی گێلوکە

گازۆر– بەتاقەت‌و توانا، بەهێز

گازکردن– گۆرانی گوتن بەدەنگی خۆش

چاکی گازدەکرد

گاسەر– سەر گەورە، سەر ئەستوور

گاشە– بەڵا

تووشی گاشە بووم

ئیستاش نەوەکایەکێ بێت بەسەرا، با منیش تووشی گاشە نەبم

گاشە خۆر– خۆرت‌و بەهێز

یەك لە بەگلەر بەگەکانی عوسمانی کە خۆی بە گاشەخۆر دەزانی سەرەڕێی لە محمد گرت

شەرەف ل١١٥

گای قەرە بەگی– مرۆڤی بەناوبانگ ناسراو لەلایەن هەموو کەسێکەوە

ئازاد گای قەرە بەگیە هەموو کەس دەیناسێت

گجولە، گوجیلە- فێڵباز

شت لەو گجولەی ناکرێت

گوجیلە سە- گجولە بەراز

گاڵتە- کاری بێ بنچینە

گاڵتە پێ کردن- هەڵخەڵەتاندن

گاگۆ- مرۆی ئەحمەق و نەزان

گامێش- (١) بە مرۆی زەبەلاح دەڵێن

(٢) مرۆی زۆرخۆر

گامێش و هەڵفڕین- کەسێك کە بەکارێك خەریك بێ و هیچی لێ نەزانێ

گاور- بێ ویژدان لەکارو مامەڵەدا

ئەو گاورە شتی لێ ناکرێت

گاورکار- بێ بەزەیی و بێ ویژدانی لە کاردا

گاو گۆلك- خەڵکانی بێ عەقڵ و ئەحمەق، خەڵکانی نەزان، دواکەوتوو

گای بنە- ئەو کەسەی شەڕو ئاژاوە دروست دەکات و خۆی تێدا بەشدار نیە

هەموو قەباحەتی گای بنەیە

گرد- بنیادەمی پایە بەرز

گران- (١) تەمبەڵ

لەش گرانە

(٢) چەتوون و دژوار

دەردم گرانە

(٣) زەحمەت و ناخۆش

شت بە گران دەکەوێت

(٤) پێ ناخۆش

قسەکەی لە دڵی گران هات

(٥) سەگین- مەند- بەرێز

گرانبار- کەسێ خێزانی زۆرەو زەحمەت کێشە، کەسێ کە باری ژیانی قورسەو گران بێ

گران مایە- بنیادەمی بە هونەرو جەوهەر

گرانی- شەرمو پشوو لەسەرخۆیی- سەنگینی، مەندی

گران فرۆش- بەفیز، بەدەعیە

گران دەفرۆشێ- بەفیزی، بەدەعیەی

گرێی دەستی مەخە دانی- کارەکە ئالۆزتر مەکە

گرتن- خستنە ناچاریەوە

بەقسان گرتم

گرتنە دڵ، لەدڵ گرتن- راگرتنی رك یا قسەك لەدڵ، دڵ گیربوون لە شتێکی ناخۆشو لە دڵ دەرنەچوون

گرداق، گەرداو- کارەساتو بەڵا، چورتم

گردە- کورتە باڵا

عەولا گردە- کابرایەکی کورتە باڵا بوو

گڕ گرتن، ئاگر گرتن- سوور بوونەوەو توورە بوونی کەسێ

شا عەباس بە بیستنی ئەو دەنگو باسە تەمێکی بەسەردا هاتو گڕی گرتو لە ڕکان ئاورینگێ دینان

شەرەف ل١١٨

گریان- پاڕانەوەو ناورانەوە

گریان- ناخۆشیو ئێشو ئازار چەشتن

ژیانم هەمووی گریان بوو

گرێدان، خۆبەستان- دوەبەر کردنی ئەسبابی شەڕو سەفەر

گرێو گۆل- کارێ کە سەرەو دەری لێ ناکرێ

وات کردە گرێو گۆل هەر سەر دەرناکەم

گرێی دڵ– خەمو خەفەتی دڵ

گژاندن– ئاژاوە نانەوە

گلاندن– دووچارکردنی یەکێك بە زیانێکی گەورە

گڵاو– مرۆی بەدفەڕو بێ ئاکار

ئازاد زۆر گڵاوە

گڵاو بوون– بەدفەڕ بوونو بێ ئاکار بوون بەهۆی کەسێك یا کارێکی ناڕەوا

بەقسەی ئازاد هەموویان گڵاو بوون

گڵاو کردن– بەدفەڕ کردنو بێ ئاکار کردن

ئازاد کابراشی گڵاو کرد

گڵاوی– بەدفەڕیو بێ ئاکاری

کابرایەکی گڵاوی دەوێ

گلێنەی چاو– زۆر خۆشەویست

گلێنەی چاوم بێ نایدەمێ

گۆ بردنەوە– سەرکەوتنی یەکێك لە کارێکا

گوو بەخۆدا کردن– کار بەخراپی کردن

گۆبەل، گۆه بەل– مرۆی لەسەر هەست

گۆبەل کردن– کۆڵە کردن، شوفاری کردنو خۆ لەقسەی خەڵك گرتن

گووپ گوشاد– زار زل

گوپی– بەڵێنی بێ کردار، هەر قسەو بە عەمەل هیچ

گوو بە گوو– کارێك کە ئەنجامی خەراپ بێ یا ناخۆش بێ

گوو پێ خواردن– پەشیمان لەکارێ کە ئاکامی باشی نەبووە

گوو پێ خوراو – کەسێ کە لەکاری خراپی خۆی پەشیمان بێ

گوو پێ خواردن– ئازاردانو پەشیمان کردنەوەی کەسێ لە کارێك

گۆترە کاری– کاری بیر لێ نەکراو

گوتن– ئاواز خوێندن، گۆرانی گوتن

گووتێبوون- کار تێك چوون‌و خەراپ بوون
گوو تێ کردن- کار تێك دان‌و خەراپ کردن
گویی سووك- لەسەرهەست، زوو قسە وەرگرتن
گوو تێ کردوو- کار تێك دەرو خەراپ کەر
گوو تێ نەکەر- کارتێك نەدان‌و خەراپ نەکردن
گۆج- نەزان کار
ئەو کارە بەو گۆجەیەی ناکرێ
گوجە دڵ- منداڵ، فەرزەندە
گوو خاران، گوو خواردن، گوو خوارن- پەشیمانی
گوو خواردنی بۆ ماوە
گوو خۆر- هەلە کەر
گوو خۆری- پەشیمانی
گوو خۆری بۆ مایەوە
گوو دەرخوارد دان- تەمبێ کردنی مرۆی بێ ئاکار
گورجی- ئافرەتی جوان
گورز- هێزو توانا
گورزین بۆ لێدانی دوژمن
گورز لێ دان- زیان پێ گەیاندن
گورزەکی لێدا نابووتی کرد
گۆڕ شێلان- جنێو بە مردوو دان
گۆڕ گومبوون، گوڕ بزربوون- ون بوون‌و نەمانی ناوونیشانی یەکێك
نەوزاد گۆڕی گومبوو
گورگ- فێڵبازو تەماحکار
ماملە لەگەڵ ئەو گورگانە باش نیە
گورگ- زۆردار

گورگ‌و مەڕ پێکەوە ئاوی دەخۆنەوە

گورگان خواردو- کەسێك کە لەلایەن یەکێکی ترەوە بە فێڵ دووچاری چورتمێك کرابێ، تووشی بەڵا بوونی بێ فریارەس

بە گورگان خواردنی دا

گورگ نیشاندان- ترساندنی کەسێ بەقسەیەك یا بەکارێکی ترسناك

گورگاور- ئاوڕدانەوەیەکی بە پەلەو لە غارداندا

گورگاوران دەداتەوە

گورگ نەخۆرە- پیرەژنێکی ناشیرین کە کەس تەماعی تێ نەکا، کیژو ژنی ناحەز

گورگ نەخۆرە- مرۆی بێ فەڕ کە کەس سوودی لێ نەبینێ

هەموو گیانی گورگ نەخۆرەیە

گورگە- دەسبڕو فێڵبازە

گورگ‌و مەڕ- خەراپ‌و باش- زۆردارو زۆرلێکراو

لە رۆژگاری ئەودا وەك کورد دەڵێ گورگ‌و مەڕ پێکەوە ئاوی خواردۆتەوە

شەرەف ل٧٨

گورگی دەم بەخوێن- تاوانبار، زاڵم

گورگ کوشتن، شێر کوشتن- لە ڕووی سوکیەوە دەڵێن کە کەسێ وا خۆی نیشان بدات کاری گەورەی ئەنجامداوەو کارەکەشی هیچ نەبێت

گورگو مێش- زمان لووسی بێ ئاکار

گورگ‌و شوانی- کەسێ فێڵبازو ساختەچی کاری بەسودی بدرێتە دەست

گورگی باران دیتە، گورگی باران دیدە، گورگی داو دیدە، گورگە بالان دیتە- مەردومی فێڵبازی دنیا دیدە، پیاوی بە تەجریبەو ئەزموون- پیاوی زیرەك‌و لێزان لە ژیان

گورگی هار- پیاوی بە ئازارو بەدکار

گوریسی کورتە- بە یەکێ هەلپەرست دەڵێن

گوریسی ناو هەمبانەی- مرۆی زۆر فێڵبازو خاپینۆك
گوژالك- زۆرتاڵ
گوش- ئاوەز، فام، هۆش
پیاوی بێ هۆش‌و گۆش
گۆشت پیس- یەکێ کە برینی درەنگ چاك بێتەوە
گۆشت تاڵ، گۆشت گران- بەد سکوت، ڕەزا قورس- ئێسکە گران- هێسك گران
گۆشت خۆش- کەسێ کە برینی زوو خۆش ببێتەوە، کەسێ کە برینی زوو چاك ئەبێتەوە
گۆشتی خۆ خۆش کردن- خۆ خۆشەویست کردن
گۆشتی دەخورێ- کچی تۆزێك جوان بێت
گۆشتی سەر چەپەر- شتی کەم نرخی بێ نموود، هەرزان قیمەت
گواوی- شتی زۆر پیسی خراپ
گوڵ بەدەم- کچی جوان
گۆلك- بێ عەقڵ‌و فرقیرۆکە
گۆشەگیری- سۆفیەتی‌و تەرکە دنیایی
گوو شێلان- تووشی گێچەڵ بوون لەبەر خاتری کەسێ، کەوتنە دەردی سەر لەسەر کەسێ
ئەوە گووی تۆیە دەیشێلم
گوو کولاندنەوە- پژدی زۆر، ڕەزیل
گوو کولێنەوە- پژدو چروك
گووکەر- ترسنۆك، بێ غیرەت، هیچ لەدەست نەهاتوو
بەو گوو کەرەی ناکرێت
گوڵ- جوان‌و پاك
ماڵەکەیان کردە گوڵ

گوڵ- بێ عەیب، پاك‌و بێ فڕوفێڵ
لە گوڵی پاکترە
گوڵ- خۆشەویست، ئازیز
ئامێنی گیان تۆ گوڵەکەمی
گوڵەکەی من لە ماڵە
فۆلکلۆر
گول بەژن- بەژنی ڕێك‌و پێك‌و جوان
گوڵ چاندن- چاکەو پیاوەتی کردن لەگەڵ مەردوما
گوڵ خونچە- خۆشەویست، دەلال
گوڵ خونچە وەی وەی گوڵ خونچە
گوڵ خونچەی شاری کۆیە
بەر دەرگامان لێ مەگرە
بەم نوێژی نیوەڕۆیە
فۆلکلۆر
گوڵ‌و دڕك- باش‌و خەراپ
ئەگەر گوڵ نی دڕکیش مەبە
گون دەرهێنان- (١) خەساندن
(٢) نەوێران
گون ڕەش- زۆردار
گوێچکە ئاودان- زۆر بە وردی ئامۆژگاری کردن
گوللە- خێرا لە ڕۆیشتن، گورج
دەڵێی گوللەیە دەڕوا
گولە- کەسێ ژنی جوانی هەیەو ئیرەیی پێ دەبەن‌و خۆی بودەلەیە-مرۆڤی بەژن کورتی ژن جوان‌و باڵا بەرز
گولە لە کێوی ئاتێ          ئەللە لێدا یەکانە

بەڵکو بۆم بەجێ بێڵێ    ئەو دوو لێوە قەیتانە

گوڵە بەرۆژە- بە مرۆی بێ هەڵوێستو هەلپەرست دەڵێن

گوڵی مەجلیسان- مرۆی قسە زانو کۆڕ ڕازێنەوە

گومڕا- کەسێ لەدامو دەستووری ئاسایی لای دابێ

گون پێ نەچون- پەك نەکەوتن بەکارێ یان کردەوەیەك

گوندێكو نۆ میر- بە تەوسەوە ئەوترێ بە شوێنێك کە لەجیاتی یەك گەورە سێ چوارەکی تیابێ هەریەکە لەلایەکەوە فەرمان بکات

گون گەورە کردن- پیا هەڵدانی بەدرۆ

گون گەورە بوون- لەخۆ بایی بوونی پیاوی بودەلە بەهۆی پلەو پایە

گون گرتن- خستنە ناچاریەوە

گون گیراو- ناچار کراو

گونە رەشە- بەڵای چاوەڕوان نەکراو

گونە گیسك- کورتە باڵا

گون هەڵسەنگاندن- مەرایی کردن

گوهبەل- شۆفار

گوهبەلی- شۆفاری

گوێرەکە لە پەمۆ دەرکردن- خەڵك بە پاڵەپەستۆو لێدان لەشوێنی دەرکردن

گوێ لە مست- لە پرسو ڕا دەرنەچوون

گۆهرەپ- نەزانو ئەحمەق

گۆهشۆر- خەجاڵەت

گۆهماکەر- بێ ئاوەز، بێ عەقل، کەرو ئەحمەق

گوێ بەخوێن دا نەهاتن- پارێزگاری کردن

گوێ بەگوێ- دۆستایەتی زۆر نزیك

گوێ بگری بنا گوێ لەگەڵ دێ- بە مرۆڤی زۆر بەر فەرمان دەڵێن

گوێ بەل، گوێ پیس- کۆلەکەر- شۆفار

گوێ برین– شوورەیی بەسەر کەسێ هێنان، ریسوا کردنی کەسێ

گوێ ڕاکێشان– تەمبێ کردن

گوێچکە نەلەقیان– گوێ نەدان بەقسەی کەس، گوێ نەدانی یەکێك بە کارێك

گوێ لێ بوون–لێ تێکچوون و شڵەژان بە کارێکی ناڕەواو نابەجێ

گۆیزە– کورتە باڵای تەنگەستوور

گوێزی ئازا– مرۆی ساغ و چالاك

گوێزی ناو بێژەنگ– بزۆزی ئۆقرە نەگر

گوێزی ناو دەغیلە– کورتە باڵای زرینگ، مەردومی بچکۆلەی زیت و زرنگ

گوێ قولاغ، گوێ کوڕ، کور گوێ– لەسەر هەست بۆ بیستنی هەواڵێك

گوێ لەق– بنیادەمی کەرو نەفام

گەجەرو گوجەر– خۆڕی و تۆڕی، مەردومی هەرچی و پەرچی

میر حوسێنی داسنی چەند جارەکی تر شەل و شکستەو گەجەرو گوجەری یەزدیانی کۆکردەوەو شەڕی خۆ دڕینی نایەوە

شەرەف ل٤٩٣

گەبزە– بەفیز، لەخۆبایی، بادی هەوا

گەڕانەوە– واز هێنان لە کاری ناڕاست و ناڕەوا

کابرا گەڕایتەوە

گەڕاوە– واز هێنان لە کاری ناڕاست

کابرایەکی گەڕاوەیە

گەرداو– چورتم و تەنگانە، بەڵا تووش هاتن

گەردن کەچ– مەردومی فەرمانبەر، گوێ بە فەرمان

گەردن ئازا کردن– لێ خۆش بوون و لێبوردن

گەردن گرتن– بەرەنگار بوون، بەگژا چوون

گەردن لەموو باریکتر– گەردن لە موو نەرمتر– بەر فەرمانبەر، رام

گەرم– تازە، نوێ

گەرمە برین– تازە برین

گەرماو گەرم– پەلەو زوو، زوو بە زوویی، بێ درەنگ کردن

گەرماو گەرم گەیشتە سەری

گەرمبوون– رشت بوون لەکار

گەرمبوون– تووڕە بوون

بەقسەکەم گەرم بوو

گەرمکردن– قسە زۆر کردنی یەکێك

گەرمە– زۆر باشە، بە هەرمێنە

بازاڕ گەرمە

گەرمە برین– کەسێك کە تازە بەتازە خەفەتێکی زۆر قورسی تووش بووبێ

گەرو گرتن، بەرۆك گرتن– بەگژدا هاتن

گەرم کردن– قسە زۆر کردنی یەکێك

گەریدە، گەرۆك– دنیا دیدە

گەزارە– زمانی درێژ

گەزارەی لێ کێشاوم هەرچی [illegible] پە پێی کردوم

گەرمو سارد– ناخۆشی رۆژگار

... جەمشید بەگ پیاوێکی دنیا دیتەو بەگەرمو ساردی ژیان ئامیتەو خاوەن ئەزموون....

شەرەف ل٣٧٢

گەزتن، گەستن– زەرەرو زیان بە خەڵك گەیاندن

گەز گەز باڵا کردن– زۆر پێ خۆش بوون، کەیف خۆش بوونی زۆر

گەزندە– پیاوی بەدفەڕ، مەردومی بە زیان

گەسك لێدان، گێسك لێدان، گەسکدان، دەست پێدا هێنان– بردنی هەموو شتێ لە ماڵدا، بردنی شتو مەكو پاکۆ لێدانی

دز گەسکی لەماڵی بارەمدا– واتە هیچی تیا نەهێشت

گەش- بەکەیف، روی بێ گرژ
بەڕووی گەشەوە دواندی
گەشاندنەوە- کەیف خۆش کردن
گەشانەوە، گەش بوونەوە- کەیف خۆشی و بەدەقی یەکێك، شاد بوون
گەشی - بەدەقی و کەیفی، خۆشی و شادی
گەیاندنە مریشکە رەشەی- کار تێکدان و شەڕ دروست کردن
هەر چابوو چا تێم نەپەڕاندن و نەم گەیاندە مریشکە رەشەی
بۆرە ل١٣
گەلخۆر- زۆرداری بێ بەزەیی
گەن- کاری کرێت، کاری فێڵبازانە
کارەکەت گەنە
گەندە پیاو- نامەرد، بێ غیرەت
گەندەخۆر، گەنگەخۆر- رەزیل، قرچۆك، رژد
گەنم و جۆ- مووی رەش و سپی، ماش و برنج
گەنم‌وجۆ- (١) رەشبەڵەك، کچ و کوڕ دەست گرتن لە شایی،(٢) سپی و رەش
گەنمی قەندەهاری- کەسی چاك و بەجەوهەر کە لایەقی هەموو پلەو پایەیەك بێت
گەورە- پایە بەرز
کابرایەکی گەورەیە
گەورە بوون- پلەو پایە بەرەو ژوور چوون
گەوهەر ناس- بنیادەمی زۆر زاناو دانا
مامۆستا گەوهەر ناسە
گەوهەر ناسی- زانایی و دانایی زۆر
گیان لەسەر دەست- ئازاو بوێر، لە مردن نەترسان
گیای بوهاری- تەمەن کورت

گیای هیناچۆکان– بۆ فریودان دەگوترێ– پێك هێنانی کاری کەسێك هەر بەقسەو بەس

گیرفان بڕ– دز

گیرفان بڕین– دزین

گیسکی هەیاسی– کەسێ لە ترسی کارێك یا کردەوەیەك یان کەسێ گەشە نەکات

گیرفان پووت– هەژار، فەقیر، نەدار

گیرفان لێدان– دزین لە کەسێ کردن و لە گیرفان دەرهێنان

گیان– خۆشەویست، ئازیز

بەڵێ گیانەکەم، گیان دەوەرە

گیانی بە گیانی– زۆر خۆشەویست، زۆر نێوان خۆش

گیان بە دەستەوە دان– سازدان و گونجان

گیان بەر– ئازا لە جەنگ، بوێر لە شەڕ

گیان لەسەر دەست– ئازای لەخۆ بردو

گیانی گیانان– گراوی– دلبەر

گیپەی جۆی– بەشتی نەقۆلا دەڵێن

گێرە کردن– هاتوچۆ بەسەر قوڕدا کردن

گێرە پێ کردن– کەوتنە دوای یەکێك و زۆر ماندوو کردنی

گێرە نەکەر– تەمبەڵ

گێرە شێوێن– ئاژاوەچی

گێرەو کێشە– گرفتاری و دەردەسەری

گێژاو، گێژەن– ئەندێشەو مەترسی

خۆ لەو گێژاوەی بپارێزە

## "ل"

لا- نەسازو سەرسەخت

کابرایەکی لایە هەر ناساریّ

لابردن- لەپلەو پایە هێنانە خوار

کابرایان لە مدیری لابرد

لاپەڕە وەرگێڕان، لاپەڕە هەڵگێڕانەوە، لاپەڕە هەڵدانەوە- گۆڕین و کۆنکردنی قسەیەك، گۆڕینی باس و خواس لەسەر مەبەستێ

لاپەڕەی نوێ کردنەوە- سەرەتای برادەراتی کردنەوەو دۆستایەتی کردن لەگەڵ کەسێ کە دۆستایەتی و برادەرایەتی پچڕابێ

لاچوون- لە پلەو پایە دەرکردن

بەڕێوەبەری پێشوو لاچوو

لاخۆر- چەورەو ماڵانگەڕ

لادان- گومرابوون- لە ڕێی ڕاست لایاندا

لادان- دیەنی و میوان بوون

فەرموون لادەن

لای ئەوان لاماندا

لادە- میوان بە

لار، خوار- کەسێ لەسەوداو مامەڵەدا فێڵ بەکار بێنێ بۆ سوودی تایبەتی خۆی، ساختەچی

لار بوونەوە- مردن

لار ڕوانین، خوار ڕوانین- بە قین و ڕکەوە تەماشا کردن

پیاوم دەوێ لار بڕوانێتە لوڕستان

شەرەف ل١١٤

لارە مل- مەردومی مل کەچی بێ دەسەڵات

لاری– بە قسە نەکردن، بەرگر، لەمپەر

من لاریم لێت نیە ، چی پێت دەڵێ لاری مەکە

لاڕێ– لاسارو نەساز

لاڕێ بوون– بایی‌ی بوون

لاڕێ کردن– لە فەرمان دەرچوون

لارە مل– بەرفرمان، قایل بو

بەلارە ملی بێ باوکان قەسەم

لاڕێ گرتن– بایی بوون

لاشخۆر– پارەداری پیسکەی پارە بەسووت دەر

لاشەڕ– مەردوی هێمنی لەسەرخۆ

لاق بەتەڵەوە بوون– تووشی بەڵا بوون

لاق چەقاندن– سوور بوون لەسەر داوای خۆ

لاق درێژ– کەڵەگەتی کزو باریك، دۆلە درێژ

لاق شکاندن– تەمبێ کردن

لاق شکاو– تەمبێ خواردوو

لاکەی سەر هاتن– ماندوو بوونی زۆر

ناتوانم بڕۆم لاکەی سەرم دێ

لاکەی سەر هاتن– کز بوون‌و زراو بوون– لاوازو باریك بوون

لاڵ– قسە بۆ نەکران لە ترسان

لاڵبوون– قسە نەکردن لە ترسان

لالامو کردن، لێوە هاتن– زۆر مەست‌و سەرخۆش‌و بێ هۆش

هێندە مەستە لالامو دەکا

لالایی– مەرایی–، لەگامی، ریایی

محمد کەسەری بۆ عاسمان نەدەچەماند نەی دەتوانی لالایی لەبەر میری میرانی بەغدا بکات

شەرەف ل١١٥
لا لێ کردنەوە- یارمەتی و دەستگیرۆیی یەکێك
لایەکیان لێ کردینەوە
لام سەر لای- بێ گوێ پێ دان، گەلایی، کردنی کارێك بەنا بەدڵ و ناپوختی
کارەکانی لام سەری‌یی دەکا
لانە- جێ حەسانەوەی بنیادەم
خانەو لانەیەکمان هەیە
لانەی شیران- شوێن و مەڵبەندی پیاوی ئازا
بڕۆ لاوۆ ئەوێندەری لانی شێرانە لانی شێران نابێ بێ شێر بێ
کور ئۆغلو ل١٠٧
لانك- شوێنی سەرتای دەست پێ کردنی کاری پیرۆزی شۆڕش
خۆشناوەتی لانکی شۆڕشی نوێ بوو
لباد- کەسێ لە ماڵی خۆ یا لە ناو کرمەڵ کەس بە قسەی نەکات
باوکت لبادە
لچ خوار- ناقایل، ناڕازی
لچ خوار بوون- نا قایل بوون، نارازی بوون
لچ خوار کردنەوە، لچ خوارەو کردن- ناڕەزایی قەلسی
لچ و لێو کردن، لچ و لێو بڕین- ریسوا کردن و تەمبێ کردن
لچ کرۆژتن- زۆر توڕە بوون
لچ هەڵهێنان، لچ لێ خوار کردن- گاڵتە پێ کردن
لچ هەڵقرچان- لچ هەڵقرچاندن، لچ هەڵقورتاندن- شاندانی توڕەیی، تورەیی نیشاندان
لچ هەڵێنان- سەرتای دەست پێ کردنی گریان
تەماشاکە منداڵەکە لچی هەڵێنا
لغاو کردن، لغاو گرتن، لغاو توند کردن- گێڕانەوە لە کار، ڕێگە نەدان

لموز بڵند– بەفین، لەخۆبایی، خالور، غلور

لموز بڵند بوون– بەفیز بوون، لەخۆ بایی بوون، خالور بوون

لموز بڵندی – بەفیزی، لەخۆ بایی

لموز خوار– زویرو تورە، قەلس

لموز خواری– زویری، تورەیی، قەلسی

لموز شکان– لووت شکان– کەپو شکان– تەمبێ بوون

لموز شکاندن، لووت شکاندن، کەپو شکاندن– تەمبێ کردن

با هەر ئەمڕۆ لووتی بشکێنین ئیدی رووی نیە بێتە ناو پیاوان

زەبووك ل٥٤

لموز شکای، لووت شکای،کەپو شکای– تەمبێ کراو

لموز شۆڕ– ناقایل، نارازی

لموز شۆڕ بوون– ناقایل بوون، نارازی بوون

لموز شۆڕ کردن– ناقایل بوون، نارازی بوون

لموز شۆڕی– ناقایلی، نارازی

لموز وەعەرز کەوتن– بەزین و شکست خواردن

لنگ مەتك– شووم، بەدفەڕ

لنگە لەرزە– زۆر ترسان

لنگ هەلکردن– سازو ئامادە بۆ ئەنجامدانی کارێك

لنگ هەلکراو– سازو ئامادە

لووت بڕین– ریسوا کردنی یەکێك کە کاری خەراپی کردبێ

لووت بڕاو– ریسوا کراو

لووت بە بەر خۆدا هاتنەوە– عارنان و پەشیمان بوونەوە لە شتێك

لووت بەخۆدا هاتنەوە، لووت شکان– خەجاڵەتی و پەشیمانی

لووت بەرز– بادی هەوا، بەفیز

عومەری زاوا بە هەزار نیازو نازەوە بەفیزو شانازیو لووت بەرزییەوە ڕووی کردە پەردەی بوکی تازە

شەرەف ل٣٥٧

لووت چووزانەوە– زۆر پێ ناخۆش بوونی کارێك

لووتخوار– قەلس، نارازی

لووتخواربوون– قەلسبوون، نارازی بوون

لووتخواری– قەلسی، نارازی، دڵگیریو ناڕەزایی لە شتێك

ئازاد لووتی لێم خوارە

لووت داژەندن– ماتیو زویری، سەر وەبەر خۆ نان بە ناڕەحەتیو خەمباری

لووت لێخوران، لووت لێخوریان– ئارەزوو کردنی کارێك یا کردەوەیەك، خەیاڵ لێ کردنو بەتەما بوون

لووت هەڵکردن– زویریو دڵگیری یەکێك

لووس– جوانو مووی لێ نەهاتبێ

ژنێکی لووسە

لووسبوون– شەرمو حەیانەمان، بێ ئیحترام

لووسبوە شەرمی پێ نیە

لووسکە– لاوی بەد ڕەوشت

لووشکە هاویشتن– بەمرۆی جینگزو نەساز دەڵێن

لۆك– ئازاو نەترس

لوولبوون– قەڵەو بوون

لولدان– بەپەلە خواردن، بەخێرایی خواردن

خواردنەکەی لول دا

لولدان– کەسێ دانە پێشە خۆ بە مەبەستی گرتنی

لە ئامێز گرتن– داڵدەدانو حەواندنەوەی کەسێ

خانوەکە چەندین ئادەمیزادی کەساسی تری لە ئامێز گرتبوو

رۆمان– شار

لەناو دەرهاتوو– زیرەكو لیزان

لە ئاگری دوو دڵیدا سووتان– ڕاڕاییەك كە زۆر ئازارت بدات

لە بن نیر دەرهاتن، لەژێر نێر دەرهاتن– لەژێر فەرمان دەرچوون

لەكەوڵی خۆ خواردن– كەسێ لەدەست مایەی خۆی بخوات

لەبەرسیله هەلوا دروست كردن– واتە زۆر سەبرو ئارام گرتن

لە سیری هەتا پیوازی– هەمووی

لەسیری هەتا پیوازی باس كرد

لە مەحەك دان– تاقی كردنەوە، جەرباندن

لەئاودان، بەئاودادان– بە فیڕۆ دانی پارەو ماڵ

پارەكەت لەئاودا

لەئاوی روون خاوێن تر– مەردومی زۆر بێ خەوش دوور لە زۆرداریو فرتو فێڵ

لەبار بوونەوە– بێچوو بوون، زان، مناڵ بوونی ئافرەت

لە بڕ بوونەوە– لەڕو لاواز بوون بەهۆی نەخۆشیەوە

لەبرسان مردی– مەردوی رژدی چروكی

لەبن– نزیك

رەشكێن لەبن هەولێریە

لەبن گوێ– زۆر نزیكە لێی

هەڵۆ لە بن گوێتی واز لە خوێندن بێنێ

لە بن گوێ خوێندن– هاندان، دنەدان، گاڵ دان

لە بنی كودی دان– هەموو شتێك ئاشكرا كردنو ئاشكرا گوتن

لەبن هێنان– پارە لێ سەندەن بە ناڕەوایی

ئەو كوڕە لەبنی هێناین

لەبەرد دان– بەفیڕۆ دانو لەناو بردنی دارایی، فەوتاندنی ماڵ

ئاسۆ هەرچی بوو لە بەردی دا
لە بنەوە- بەدزی، بە نهێنی
لەبنەوە قسە یان کردەیەك
لەبەر خوێندن، لەبن گوێ خوێندن- رازی کردن و هێنانە ڕەدا بەپێ هەڵگوتن
لەبیر نەکردن، چاو لێ بوون- یارمەتی دان و کۆمەك کردن
لە پشتەوە خەنجەر لێدان- بە فێڵ و گزی لە کەسێ دان
لەبەر چاو- ئەمەك لەبیر نەکردن، بەوەفا، پێ زان
لەبەر ڕۆیشتن- کار ئەنجام دان
کاری لەبەر دەڕوات
لەبەر دڵان- خۆشەویست، دەلال
لە بێژینگ دان- جودا کردنەوەی باش لە خەراپ
لە بێژنگیان داو هەندێکیان دەرکرد
لەبنەوەیە- بە دیمەن باش و لە دەروون خەراپ
لەبنی کودی دا- ئاشکرای کرد
لەپشت- یارمەتی دەر
من لە پشتتم بۆ ئەو کارە
لەپشت بوون- یارمەتی دان، هاریکاری بوون
لەپشت پەردەوە- بە نهێنی کارکردن و ئەنجام دانی
لە پشتی- یارمەتی دەری، هاریکاری
لە پشتی بووم هەتا سەرکەوت
لە پشتەوە- کاری نامەردانە ئەنجام دان، بە فێڵ لێدان و گرتن
لە پشتەوە لێیان داین
لە پشت راوەستان- لایەنگری کەسێ بەرامبەر بە دوژمنەکەی
لە پەل و پۆ خستن- نابووت کردنی یەکێك
لە پەل و پۆ کەوتن- لات بوون، نابووت بووت، هەژار بوون، پارە نەمان

لەتکە نۆکی گشت چێشتێک- ئەو کەسەی لەگەڵ هەموو کەسێ خۆی بگونجێنێ

لە چوار پەلان گوێی ساغە- کاری زۆر ناتەواوە

لە پێست چوونە دەرەوە، لەپێست دەچوون- تووڕە بوونی زۆر، تووڕەبوون و دڵتەنگ بوون لە کارێك یا کردەوەیەك

لە داخی نەریمان کە ناخوێنێ وەختە لە پێست بچمە دەرەوە

لەپێش، نزیك- کەسێ پەیوەندی زۆر نزیکی هەبێ لەگەڵ کەسێ یا هەر بابەتێکی تر بێت

لەتام دەرچوون، لەئەندازە دەرچوون، لە حدود تێ پەڕاندن- کاری نائاسایی کردن

لە تڕی سەی چوو- بەفڕۆ چوو، بەخۆڕایی چوو، بەلاش ڕۆیشت

لە تێلەگە نان، بەداوی وەکردن- خەم لە هەموو شت خواردن

لەتە جەرگ- فرزند، ڕۆڵە

لە جێ ووشك بوون- حەپەسان، تاسان

لەچاو تروکانێکدا، لەچاو چونانێکدا، لەچاو قوچانێکدا- زۆر خێرا، زۆر بەئەسپایی

لەچاو تروکانێك بزر بوو

لەچاو گیران- پێ نەزانی و سپڵەیی

لەچاوی دایە، لەبەر چاوی دایە- بە ئەمەگە، چاکە لەبیر ناکات، بێ وەفا نیە

لەداو کەوتن، بەداوی وە بوون- گیران

لەدەست دەرهاتوو- کەسێ کە لاساری دەکاتە پیشە

لەدەست دەرهێنان- هەڵخەڵەتاندنی کەسێ بۆ کاری ناڕەوا کردن

منداڵەکەیان لەدەست دەرهێنا

لەچکدار- پیاوی بەناموس و غیرەت

لەخوا نەترس- زۆرکار، زۆردار

لەخۆ دەرچوون- بایی بوون، بادی هەوا بوون، فیز پەیا کردن

لەخۆڕیان- سەرنەکەوتن لە کارێ کە خەریک بوە

لەخەت دەرچوون، لە قەڵەم دەرچوون- هەلە کردن، کاری نابەجێ کردن

لەخەم ڕەخسین، لەخەم ڕستن، پێ گەیشتن- کزر بوون و پێ گەیشتنی شتێك

کوڕەکەت لە خەم ڕەخساوە

شینابیەکەم لەخەم ڕەخساوە

لەخەو ڕاپەڕاندن، لەخەو وەئاگا هێنان- ئاگادار کردنەوەو وریا کردنەوەی کەسێك لە کارێك کە هەست پێ نەکا

لە خم نان- بەڵا بەسەر هێنان

لە خمێت نێم

لەداو دەرهاتن- رزگار بوون لە تەنگانەیەك

لەداو دەرهاتوو- رزگار بوو لە چورتمێك

لەدەست چوون، لەدەست دەرچوون- نەمان و لەناوچوونی شتێك، نەمانی شتێك کە بنیادەم بۆیەتی

لەدەست هەلوەرین- یارمەتی دانی کەسی

لەدەست هەلنەوەرین- ڕەزیل، قرچۆك

لەدەم دان، لەدەو دان- تەریق کردنەوەی یەکێك

لەدەوی شێر دەرهێنان، لەزاری حەزیای دەرهێنان- رزگار کردنی یەکێك لە دەست زاڵمێك بەبێ ئازاردان

لە دین دەرچوون- زۆر توڕە بوون- لە پێست چوونە دەر

لە ڕێ دەرچوون، لەڕێ لادان- گومرا بوون، لادانی یەکێك لە ڕەوشت و خووی جوان

لەڕێ دەرهێنان، لەڕێ دەربردن- هەڵخەڵەتاندن و فریودانی کەسێ

لە ڕوودان- دەقاودەق قسە پێ گوتن بە یەکێ

لە ڕوودا وەرگەڕان، لە ڕوودا وەستان- بەرپەرچ دانەوە، زیت بوونەوە

لەزار ترازان، لە زمان ترازان- قسە بەسەهو کردن

لە ژێرەوە- لە بنەوە- بەنهێنی، بە پەنهانی کار کردن، کەس نەزانم

لەسەر- قەرز

دینارێکم لەسەرە

لەسەر- لایەنگرو پشتیوان

مەترسە هەموو شتێك لەسەر من

لەسەر ئاو ئاگر- زۆر بەپەلە

لەسەر ئاو ئاگر بوون- زۆر بەپەلە بوون

بۆرە لەسەر ئاو ئاگر بوو

بۆرە ل٩١

لەسەر بازنە دان، دەسەریەوە نەچوون- مەجال نەدان، بوار پێ نەدان

لەسەر پۆلو دانشتن، لەسەر ئاگر دانشتن- ئۆقرە نەمان، ئارام نەمان

لەسەر زگ کێشان- بەڵێن دان بە کەسێ بۆ کارێك کە ئەنجامدات و نەیکات

لەسەر نەڕۆیشتن- لەکورتی بڕینەوەی قسەیەك یا گوفتارێك

لەسەگ گڵاوتر- کەسێ کەزۆر خراپ بێت و تەنها بیر کاری خراپ بکاتەوە بەتایبەتی لە مامەڵەدا

لەسەری دێ و لەپێی دەرئەچێ- زۆر تەواو

ئەو پارەیەی ئەمڕۆش بۆ مەسرەفی ژن هێنانەکەی لەسەری دێ و لە پێی دەرئەچێ

ژان ل٥٤

لە سێ بەری خۆی دەرەویتەوە- واتە زۆر ترسنۆکە

لەسەر چاو، بەسەر چاو- ئامادەیی شاندان بۆ کردنی کارێك ، زۆر بە دڵەوە کار ئەنجام دان

لەسەر چوون- لێ خۆش بوون

لەسەر نەچوون- لێ خۆش نەبوون، لێ نەبوردن

لەسەر دەستان- برەودار، رەواج

لەسەر دەستان- ڕێز گرتن و خۆش ویستن

لەسەر دەستان رامان گرتیە

لەسەر ڕۆیشتن- زۆر وەری کردن، درێژە دان بە قسە

لەسیر هەتا پیوازی- لەسەرتای ڕووداوێك تا کۆتایی

لەسەر لێوی قەبر- بەیەکێ زۆر پیر دەڵێن کە نزیك بێ لە مردن

لەش، قەلب- پاش و پێشی مەردوم، شەرمێونی ژن، ئەو شوێنانەی لەشی ئادەمیزاد کە ناو هێنانی شورەییە

لەشت داپۆشە

لەشان هاتن- توانایی بوونی کردنی کارێك

لەشان گران بوون- قایل نەبوون، پێ خۆش نەبوون

لەشانە دان، لەشەدان- تێڕوانین بەوردی

لەش بەبار- دەردەدار، بیمار، کەسێك کە هەر نەخۆش و دەردەدار بێ

لەش بەدۆشاو- گاڵتە کردن بە کەسێ کە خۆی بە ناسك و نازدار بزانێ

لەش سووك، لەش سڤك- ئازا لەکار، دژی تەپ و تەمبەڵ، چەپووك

لەش قورس- تەمبەڵ، نەکار

لەشکر بەزین- ژنی سەڵتیەی زمان درێژ

لە شۆر دەرکردن- دەرکردنی کارێك یا کردەوەیەك لە ئەندازەی خۆی

لە عاردی دان، لەخشتە بردن- هەڵخەڵەتاندن و لەڕێ دەرکردنی یەکێك

لەعاردیی دان- زەرەرو زیان بە کەسێ گەیاندن

لە عاسمانان لەدوو گەڕان- زۆر عەوداڵی لە دوو گەڕان

لە عاسمانان لەدووت دەگەڕام لە عاردیم دەست کەتی

لەعین- زاڵم

لەفلسی دەدات- بە مرۆڤی قرچۆك و ڕەزیل دەگوترێ- پول پەرست

لەق بوون- لەپلەو پایە لابردن

کورسی لەق بوون

لە قوونەوە بردن– تەریق کردنەوە

لەقە لێدان– زیان بەخۆ گەیاندن، زەرەر لەخۆ دان

واز بێنە دانیشە، لەقە لەو معاشە پاکەو پوختە مەدە

سەرچاوە ل٦٤

لە قوونی سەگ نان– ریسوا کردنو جنێو پێدان بە کەسێ

لە قوڕ دەرهێنان، لە قوڕ پەڕاندنەوە– لە بەڵا دوور خستنەوە

لە قوڕێ نان– شوورەیی وەسەر هێنان

لەکۆڵ کردنەوە– لەکۆڵ خستن– رزگارکردنی لەکاری ناخۆش

لەکودی بانگدان– بەدزیەوە قسە کردن، بە نهێنی ئاخافتن کردن

لە گوپدان– ناهومێد کردن

لە لانکنان، دەلانکنان– هەڵفریواندن، لەخشتەبردن

لە لانکیم نا– هەڵم فریواند، لە خشتەم برد

لە مەنجەڵ گەڕانەوە، لە چورتم رزگار بوون– لە بەڵا رزگاربوون

لەمەنجەڵدا نەکولاو– کەسێ فێڵی لێ نەکرێت

لەوچە لەوچ– زۆر وەڕ

لەوچە لوچکردن– زۆر وەڕی کردن

لەو گۆرەی– بەبێ هۆ– بە خۆڕایی– بەلاش

لەو گۆرەی بەگژم دا هات

لێ پڕبوون– توورە بوون لەکەسێ

لێت پڕم مەمدوێنە

لێ پیس کردن– تێك چوونی کارێك لەکەسێ

لێخواردن– سوودو قازانج لەکارێ دیتن

لێدان– بەناڕەوا خواردن، دزین

لێدان لێدانە– واتە دزین دزینە

قەرزی لەسەر بوو لێدا

لێشاو- زەحف، فرە، هەموو شتێکی زۆر

نان‌و ئاو لێشاوە

لێڵ- مەردومی زویر

لێڵبوون- زویر بوون

لێڵکردن- زویر کردن

لیس تێکوتان- زۆر هاتنەوە ماڵ‌و کەم لە ماڵ دەرچوون

لێشاو- بە هەموو شتێکی زۆر دەڵێن

لێفە نوێ کردنەوە- ژنێکی تر هێنان

لیڤ شور، لێو شۆر، لچ شۆر- تووڕە

لێ گۆڕان- بەد بەخت بوون‌و ڕێ ون کردن، کاری خراپ کردن، کاری ناڕەوا ئەنجامدان

خوا لێی گۆڕیوە

لێڵاو- کوێر بوون، کۆربوون

لێڵاوم دایە بۆ ئەو پیاوە گەورە

لێنەکڕین- بەقسە نەکردن‌و بڕوا نەکردن

کەس ئەو قسانەت لێ ناکڕێ

لێو بەبار- خەمبار، مرۆی خەفەت بار

غەمگین‌و دڵ پەشێوم    بڕوانە باری لێوم

فۆلکلۆر

لێو بردن بەدەما، لێو کرۆژتن، لێو گەزتن- تووڕە بوونی زۆر یان عەزرەت‌و ئاوات

لێو گەستن- پەشیمان بوونەوە، تێگەیشتن لە کارێکی نادیار

لێ وەرگرتن- پەند قبوڵ کردن

لێم وەرگرە پێت ئەڵێم

لێوە لەرزە، لێوە لەرە- ترسانی زۆر

لێ هەڵسانەوە، لێ قیت بوونەوە، لێ بڵند بوون، لێ ڕاست بوونەوە- لێ دەرهەل بەن، تووڕە بوون لە کەسێو لە شوێنی دانیشتنی خۆ کەوتنە جموجۆڵو هەڕەشەو قسە بە توند کردن

" م "

مابەین– حەز لێ کردن، خواردن یان جلو بەرگی حەزی لێ نەکەی

لەگەڵ دوڵمە مابەینم نیە

ماتکردن– کوشتن

مارەکەم مات کرد

مار– مرۆی رکۆنیو زۆردار دەڵێن، بنیادەمی بە زەرەرو خراپ دەڵێن

رۆستەم– ئەو دوانە مارن، دوور نەخرێنەوە دڵم ئاو ناخواتەوە

سەرچاوە ل٦٢

مارانگەز– مارانگاز– مارانگەستە– مارانگەستی– مارپێوەداو– ستەم لێکراو، ترسێندراو، کەسێ کە لە کارێ یا لە کردەوەیێ زیانی پێ کەوتبێو ترسابێ

مارخۆر، زۆرداری بە توانا کە زۆرداری تر لەناو بەرێت

مارکوژ– دارکار کردنی زۆر

مار کوژیان کرد– زۆریان لێدا

مار گیسك– مرۆی بێ فەڕو خراو

مارۆسیا– مرۆی دژی رکۆنی

مارخۆر– لە زۆرداری زۆردارتر

ماری بێ ئنجازە، ماری بێ ئیجازە– کەسێ خەراپ بێتو کە هیچ لێی دڵنیا نەبیتو زیانت پێ بگەیەنێ

وەك ماری بێ ئیجازە لە دڵی من دەگری گازە

مار لە باغەڵی خۆ بەخێو کردن– پیاوی زۆردار بەخێوبکەیو یارمەتی بدەیتو کەچی ئازارت بدات

ماستی مەیو– ماستی مەیی– هێمن– ئارام

دنیای کردە ماستی مەییوو گورگو مەڕی لە دەراوێکدا پاراودەکرد

شەرەف ل٤١٨

مارو سیر، مارو پونگ– دوژمنایەتی دایمی بێ بڕانەوەو نێوان دوو دژ، دووشت هەرگیز کۆ نەبنەوە

مار رکی لەسیری دەبۆوە لەدەرکی کونی شین دەبوو

ماری بێ ئیجازە– کەسێ کە بە هیچ جۆرێ لێی دڵنیا نەبیت

ماری پێ لەزگ– مرۆی رکۆنی دەبنەوە بڕ

ماری سڕ– زۆرداری لێکەوتوو

مازو بەڕەلا– بەرەڵایی و بێ سەرو بەر گیری لە شتا

کە چووم باغەکە مازوو بەرەڵا هەرکەس بۆ خۆی بوو

ماست بەسەردا کردن– ریسوا کردن

ماستاو سارد کردنەوە– ماستاو کردن– رووپامایی کردن بۆ یەکێك، لەگامی کردن

ماستاوچی– مەرایی کەر، لەگام، خوازەلۆك

ماستو موو بژاردن– بە ووردی لێکۆڵینەوە لە کارێك

ماستی مەیو، ماستی مەیی– ئارامو هێمن

دنیای کردە ماستی مەییو

ماش و برنج– مووی سپی و رەش تێکەڵ لە ریشی پیاواندا

ماشە، مەقاش– کەسێ بەکارهێنان بۆ کاری ناڕەوا، هۆ، وەسیلە

ماشینەوە– خواردنی یەکجار زۆر

هەموو خواردنەکەی یەکجێ ماشیەوە

ماعدا هەناسەو هەناو

ماعدای خۆ تەنگ کەردش

مافەتا– بنیادەمی بەزەرەرو خراپ

ماکەر– مرۆی ترسنۆك و بێ غیرەت

ماکەر پشت– ماکەر

ماکەر مەلە– مەرایی کەری سەرزاری

ماکەری ئابلاخ- یەکێ کە هیچ کارێکی لە دەست دەرنەیەت

ماڵ بەماڵ- گشت خانوی ئاوایی

ماڵ بەماڵ گەڕیام

ماڵپارێز- دەوڵەمەندی ترسنۆك

ماڵپەرست، ماڵدوست- رژد، چروك

ماڵ کاول، ماڵ وێران- بەدبەخت، کلۆڵ، بێچارە

ماڵ کردن- ژن هێنان‌و ماڵ دامەزراندن

ماڵم هەقە- ماڵم حەقە- ماڵم قەبرە- بەراستی شایەتی دەدەم، ئەوەی دەیزانم بەراستی دەیلێم

ماڵ‌و حاڵ- جۆری گوزەران

ماڵەوە- کەیوانو

ماڵەوە دەیگوت

ماڵی با- پارەو پوولی بێ ماندوو بوون، پارەو پوولی بە هەوانتە

ماڵی دونیا- هونەرو ژێهاتی

مامۆستا- لێزان‌و زرنگ لە کارێك یا کردەوەیێ

مامە حەمەیی- مەرایی، لەگامی

مامە حەمەیی کردن- مەرایی کردن

من مامە حەمەییم کردوە

ماندوو نەبوون- واز نەهێنان لە هەوڵ‌و کۆشش‌و خەبات

مامە خەمە، خاڵە خەمە- بەکەسێ دەڵێن خەم لە زۆر شت بخوات‌و خەمی هەموو کەسی لەبەربێ

مانگا- زۆرخۆر

ئەو مانگایە بەمن تێر ناکری

مانگ گرتن- لە ڕووی سوکیەوە بە کەسێ دەڵێن کە لە هەموو شتێك بترسی

کابرا مانگی گرت

مانگی چوارده– کارو کرداری ئاشکراو روون

مانگی چوارده عەوجە بەهەنگوست ناکا

مردار– گویی ئادەمیزاد

مردار بوونەوە– خراپ خەو لێ کەوتن

مردار بوونەوە– مردنی ئادەمیزادی خەراپ لە رووی سووکیەوە دەوترێ

مردار خۆر– گەندەخۆر

مردار کردنەوە– کردنی کارێك کە زۆر بە گرانیو ناڕێکی لە ژێر دەست دەرچێ

مردو زیندو کردنەوە–نوێ کردنەوەی شتێك یا شوێنێك

مردە– کالای نەفرۆشراو لەدوکان مایەوە

مردنو سووتان– زۆر کۆشش کردنو هەوڵ دان

زاری بەستراو مردو سۆت قسەی بۆ نەهات....

بۆرە ل٩٨

مردو– مردی– مردە– نەوەستانی سەداو مامەلە لە بازاردا

مزگەوت– بە شتی پیرۆز دەگوترێ

.... چاوێکی لە کەفەکە بوو، چاوێکی لەبابی بوو، کەوتبوە نێوان دوو مزگەوتەوە.....

کۆر ئۆغلو ل١٠٤

مز لەگەروو کردن– قورقوشم لە گەروو کردن– سزای زۆر توندو تیژ

مز بەسەردا کردن– بەیەکێ دەڵێن لەرووی سووکیەوە کەلەشتی بترسی جێگای ترس نەبێ

مست قووچاو– مست داخراو– رژد، رەزیل، قرچۆك

مستو درێشە– مست دروەش– شەڕی نێوان بەهێزو بێ هێز

مشكو پشیلە– دوژمنایەتی دایمیو بێ بڕانەوەی نێوانی دوو دژ، دوو شت هەرگیز کۆنەبنەوە

ملاك كردن- چەشتنی خواردەمەنی

ملاکی ناکەیت

مل ئەستور- بەهێزو توانا، خورت

مل بادان- بەزۆر ناچار کردن، خستنە ناچاریەوە

ملی بادا لێی ساند

مل بەرز- سەربەرز- سەر بڵند- بێ عەیبو بێ کەمو کوڕی

مل بە ملێ- مل بە ملە- مل بە ملی- مل ملانی- رکەبەری، رقەبەری، رکەبەرێ

ملپان- تەمبەڵی قەڵەو

ملپان- بێ غیرەت، بێ زات، ترسنۆك

مل پێوە نان، مل لێنان- کردنی کارێكو گوێ نەدان بە ئاکامی

سوار وازی لە ماین هێناو هەر بە مەلە ملی لێناو لەو ئاوە خوڕو بە گوڕو نەهەنگ فرینە پەڕیەوە....

شەرەف ل٣٣٠

مل تێنان- خۆ تووش کردن بە کارێکی ترسناك

وەستا عەباسیش ملی تێنا

لانەوازان چیرۆك

مل حیز- ترسنۆك، قایل بەهەموو کارێکی ناڕەوا

مل خوار، مل چەوت- (١) قایل، (٢) گزیکار

ملدان، مل راکێشان، مل شل کردن- رامبوون، بەقسە کردن

ئەمیر محمدی بەو خزمایەتی‌یە ملی داو کچی خۆی کردە بوکی شای ئێران

شەرەف ل٣٦

مل شکان- تووشی بەڵا بوون

مل شکاندن- (١) رۆیینی یەکێك لە شوێنێك

با بڕوا ملی خۆی بشکێنێ

(٢) خواردنی شتێك بەزۆری

ئازاد شەش کولێرەی ملشکان

(٣) زۆر زیان پێ گەیاندن

مل شکاو- تووشی بەلاّ بوو

مل شل کردن- قایل بوون

هەردوولا ملیان بۆ ئەو بڕیارە شل کردوبرایەتیان خۆی توند کرد....

شەرەف ل٣١١

مل شۆڕ- شەرمەزار

ملکەچ- فەرمانبەری و بەقسە کردن

مل کەچ کردن- قایل بوون

مل کەچ نەکردن- قایل نەبوون، رازی نەبوون

مل کەچی- قایل، رازی

مل گرتن- بەرەنگار بوون، زۆر لێ کردن

مل ڕەچەقۆ خستن، مل لە چەقۆ هەلسون، مل لە چەقۆ سوین- کاری خەتەر کردن، خۆ خستنە گێژاوو مەترسییەوە، کاری بڤە کردن

مل نەدان، مل رانەکێشان- رام نەبوون، بە قسە نەکردن، قبوڵ نەکردن

ئەمیر خان سەری بۆ دانەنواندو ملی رانەکێشا

دم دم ل١٣

تا نەمردوە من بەزاوایی ببینی بەلاّم من ملم رانەدەکێشاو نەدەچوومە ژێر بار

تاریك روون- ل٢٥

مل لە موو باریکتر- ئامادە بۆ گشت فەرمانێ

مل وور، مل هور- بێ ئاوەز، زۆردار

مندالّەکان- ژن، کەیبانو

مندالّەکانم بردە مالّی باوکیان

منالّۆچکە، مندالّ- کەسێك کە بەتەمەن گەورەو بەکردەوە منالّ بێ

تۆ منالّۆچکەی ووڕك ئەگریت

منالّو کالّ– رووت رەجال

مو– ماوەو مەودایەکی کەم

موەك مابوو منداڵەکە بخنکێ

موو بە موو– پشکنینی زۆر بە چاکی، زۆر بەوردی لە کاری گەیشتن یا لێکۆڵینەوە لە کارێك

موو بە موو گەڕیام

موو بە نێواندا نەچوون، موو دە بەروە نەچوون– زۆر تەباو تفاق

بەو خزمایەتیە ئەوەندە لێك نزیك بونەوە وەك دەڵێن موویان دەبەروە نەدەچو

شەرەف ل١١٧

موی لووت، مووی شەیتانی– کەسێ ببێتە هۆی تێکدانی کارێك

مووی ناو ماست– ڕاستو ئاکار باش، مرۆی بێ فڕو فێڵ

موو ڕاست بوونەوە، موو گرژ بوون– تووڕە بوونی زۆر یا ترسانی زۆر

مووی شەیتانی– کەسێ ببێتە هۆی تێکدانی کارێك

مۆخ دەرهاتن– تین پێ گەیشتنو ماندوو بوونی مەردوم لە شتێکەوە

مۆر کردن– قەراردان، قایل بوون

موکردن– زۆر تیژ

چەقوەکە موی دەکا

مەبادا– کاتی تەنگانە

بۆ ڕۆژی مەبادا ڕام گرتووە

مەچەك هەڵمالّین– خۆئامادە کردن

مەچەکی مەردانەی هەڵمالّیو خۆی بۆ شەڕیان لە دەسك نا

شەرەف ل٥٣٨

مەحشەر– چەقەو گوڕە تێکەوە هاویشتن

مەڕ– فەقیرۆکەو نەزان، مرۆی بێ زیان

مەڕی بێ شوان– کۆمەڵو نەتەوەی بێ سەرکردەو بێ خاوەنو پێشەوا

مەرگ بڕین– باش پێك هێنانی كار
مەرگ كڕ– ئازاو نەترس
مەزەدار– جوانی زۆر جوان
پێم بڵێ مەزەدار بۆچی تۆراوی
وەی رەقیب چی گوتوە تۆ وا داماوی
فۆلكلۆر
مەزن– پیاوی باوەڕ پێ كراو، لێزان لە ئیش‌و كاری ژیان
وا باشە ئێمە لەناو خۆماندا مەزنێك هەڵبژێرین....
شەرەف ل٣٩٦
ژیانمان مێخۆش بوو
مەرگ كر، پلنگ دڕ– ئازا لەشەڕ
مەست– غللورو لەخۆبایی
مەسینە هەڵگر– ئەو كەسەی مەرایی بۆ پیاوی خاوەن پلەو پایە داكا
مەسینە هەڵگرتن– مەرایی كردن، لە گامی كردن بۆ پیاوی خاوەن دەسەڵات
مەلایكەت– مرۆی باش‌و بێ زیان
مەلەوان– لەكار هاتوو، زیرەك، چالاك
لەو مەلەوانە مەترسە فێڵی لێ ناكرێت
مەلەوانی– چالاكی، زیرەكی
كابرایەكی مەلەوانی دەوی كاریان دەگەل بكات
مەیمون– زۆر ناشیرین
مەیمون‌و عەبا– كەسێك بە كارێك خەریك بێ‌و هیچی لێ نەزانێ
میكرۆب– مرۆڤی بەدفەڕو بە زیان
مێبون– تەمبێ بوون، واز لەكاری ناڕەوا هێنان
ئەو زەبرو زەنگەیان بەچاو دیت ترسان‌و بە بتوونی مێ بوون لەو رۆژەوە لەوغەیان برا...

بزن و گورگ ل١٣١

مێ کردن– تەمبێ کردن

مێچکە مێچکە– مەرایی، لەگامی

مێچکە مێچکە کردن– مەرایی کردن، لەگامی کردن

میچی قومارخانە– بێ شەرمی، لاساری، گوێ نەدەر بە عەیب و عار

مێخۆش– نەباش نەخراپ– بەویژدان

مێرد لە مەیدانێیە– دڵسۆزو بەویژن کاریان بەدەستە

مێردەزمە– ئەو کەسەی لەبەر دڵی کەسێ یا کەسانێ ناخۆشەویست و دزێو بێ زیان بەخش بێت

مێردە گەورە– زۆردار، زاڵم، بێ ویژدان

مێرووله کردن– بۆ ژانی کردنی لەش دەڵێن

هەموو قەلبم مێروولەی دەکات

مێژک– زۆر خۆری تێر نەخۆر

مێش خەساندن، مێش قەپاندن– بێکار بوون

مێشك سارد– بێ توورە بوون، بە پشی، بەتەحەموول

مێش لە دەم دەر نەکردن– فەقیرۆکەو نەزان، هەژارو کەم زان

مینا شکێن– تەریق کەرەوە، روو شکێن

ماری بێ مەکان– شوێن و جێگای کەسی دیار نەبوون

"ن"

نابەدڵ– ناقایل، قبول نەکردن

نابەدڵی– ناقایلی، نارازایی

ناپاك– بەدفەڕ، تەپ ڕەش

ناپاکی– بەدفەڕی، تەپ ڕەشی

ناراست– درۆزن، فێڵباز

ناتەواو– مەردومی هەژار

ناتەواوی– هەژاری

ناری عەلی، نالی عەلی– زۆر بەدژواری

بەهەزار ناری عەلی قەرزەکەم لێ سەند

نازك، ناسك– مرۆی شەرمنی لەسەرخۆ

نافەك بڕین– ئەتك کردنی یەکێك

ناڵەبار– فێڵ باز، ساختەچی

ناڵکردن– فریودان و دەست بڕین

چاکی ناڵکردم

نان– بژێوی ژیان

نان بڕاو– بێ بەش کراو لە بژێوی ژیان

نزار– نان پەیدا کردن

ئیش کردنی شەریفانە بۆ نان پەیدا کردن چە عەیبێکی تیایە

سەرچاوە– ل٢٩

نانانە– موچە، کرێ

دوو عەلبە گەنم نانە

سەرچاوە ل٢٩

نان بدە– دەهندە، بەخشندە

نان بڕ کردن- کەسێ بێ بەش کردن لە بژێوی ژیان

نان بڕیان کردم

نان لە دەمی شێر دەرهێنان، نان لەبن بەرد پەیا کردن- زۆر زەحمەت و ناخۆشی دیتن بۆ بژێوی پەیدا کردن

نان بڕین- بێ بەش کردن لە بژێو

ڕۆستەم- هەڵئەستێ چاك تێ ئەگەیت، حەز ناکەم توشی بەزمی نان بڕینت بکەم...

سەرچاوە ل٦٤

نان بڕاو- بێ بەش کراو لە بژێو

نان بڕ بوون- بێ بەشبوون لە بژوی ژیان

نان بژێر- پیاوی ڕەزیلی قرچۆك

نان تاڵ- پیاوی چرۆك و ڕژد

نان تاڵبوون- ژیان لێ تێك چوون

ئەو زۆردارە نانی لێ تاڵ کردین

نان خۆر- خێزان و منداڵ

نان خۆرمان زۆرن

نان دان- جۆ مەردی- پیاوەتی و سەخاوەت

نان دەر- جۆمەرد- دەهەند- چاوتێر

نان کوێر- کوێر نان، ڕژد، ڕەزیل

نان لێ حەرامکردن- بێزار کردنی کەسێ هەموو دەم و ساتێك

نان ماڵ- مرۆیەك کە ئاتاجی کەس نیە- مرۆڤەك موحتاجی کەس نیە

نان و ئاو- بژوی ژیان، مایەی ژیان

نان و حەلوا- کاری زۆر هاسان

ئەم کارە بۆ من نان و حەلوایە

نان و زگ- کرێکاری هەر بەخۆراك

نان سۆل، نان‌و خوێ- بژێو، مایەی ژیان

نان نمەك- چاکەو پێ زانین

نان نەخۆر- رژد، چروك، پولەکی، دەست قوچاو

ئەو خوسرەوە سەد ئەوەندە نان نەخۆرو پولەکی‌و رژدو دەس قوچاو بوو...

شەرەف ل٢٢٢

نانی نانی- برادەری کەبۆ نان خواردن برادەرو راستی نیە

نانی قەتش- ژیان بەفەقیری

نان بێ خوێ- بەدبەخت، بەبێ شەنس

ناوبردن- خراپە گوتنی پاش ملە، غەیبەت کردن

ناوجەرگە- مەیان، دوڕ، ناخ

ناو چاوان پاك، ناو چاوان روون، نێو چەوان پاك- مەردومی خێری بۆ هەموو لایەك هەبێ

ناوچاوان ترش، نێوچەوان ترش- مەردومی مچ‌و مور

ناوچاو دێز- مەردومی مۆنی بەد

ناوچاوان بەیەکادان-تووڕە بوون

ناو چاوان قۆقز، ناو چاوان قەشقە- مەردومی بەد بەخت، کلۆڵ‌و چارە ڕەش

ناو زگ ڕەش، ناو سك ڕەش- رکۆنی، تەپڕەش، حەسود، کەسێ لە دەروونەوە خەراپ بێت بیر لە شتی خەراپ بکاتەوە

ناو زگ رەشبوون، ناو سك رەشبوون- دەغەزدار بوون

ناوك کەوتن- زۆر ترسان

ناوك کەوتوو- زۆر ترساو

ناوك گرتنەوە- هەڵخەڵتاندنی یەکێك

چاك ناوکی گرتمەوە

ناوك هێنانەوە- زەرەرو زیان بەیەکێ گەیاندن

ناوك هاتنەوە- ىزیان پێ کەوتن

ناوی مەلی خۆمان بزانین- لەکارو کردەوەی ڕێو شوێنی خۆمان بگەین
"... ناشم دەنێ پێم بڵێت بەبێ ناخۆشیو دڵ یەشان با هەر کەس ناوی مەلی خۆمان بزانین..
بلە- ژان ل٧٠
نزم- بێ ئاکارو بێ ئابڕو، کەسێ لەبەر کاری ناڕەوا نەکەوێتە بەر دڵان
کابرایەکی نزمە
نمەك- (١) خواردنی نانی کەسێك، (٢) دەلالیو دڵکێشی
نمەك کردن- نانی کەسێ خواردنو لەبیر نەچونی
نمەك کوێر- سپڵە، پێ نەزان، سفلە
نمەك دان شکاندن- بێ وەفا دەرچوون
نواندن- هێشتنەوەی شتو نەفرۆشتنی
نەبان- کەسێ کە دەنگی لەیەکێ گۆڕیوە
کاکم لێمان نەبانە نامان دوێنێ
نەباب، ناباب- بەدفەڕو بیژی
نەبوون- فەقیری بێ ماڵ
دەردی نەبوونی ناخۆشە
نەبوونی خۆشە، قۆرتی ناخۆشە
پەند
نەپاك- فێڵبازو دوو ڕوو
نەپاکی- فێڵبازییو دووڕوویی
نەپخاندن- تاریف کردنی بەدرۆ
نەپشت نەزگ، بێ بەرو پشت- ناراستو دوو ڕوو
نەتاشراو- بنیادەمی کەم فامو پەروەردە نەکراو
نەخش- بەخت هات
نەخشی هێنا

نەخش و نیگار- چۆنیەتی کاروباری ژیان

نەخۆر- رژدو لەچەر

مالّی نەخۆری لۆ چەکمە سۆری

نەخشی سەر ئاو، نەخشی رووی ئاو- بەکاری بێ بنچینە دەلێن

نەراست- درۆزن

نەراستی- خەیانەتی

نەرم- هێمن و لەسەرخۆ

نەرمبوون- هاتنە سەر رای یەکێك، رازی بوون بە داوایەکی لە کەسێ دەکرێ

نەرم کردن- هێنانە سەر ڕا، ڕام کردن

نەرمی- هێمن و لەسەرخۆیی

نەرمەبڕ- مەردومی زوبان لوسی فێلباز

نەرم هەژاندن- رازی کردن و هێنانە ڕەدا بەبێ هەلّگوتن

نەڕنایش- نەڕ نەڕ ئایش- ژنی نەقۆلای زەبەلاح

نەرەشێر- زەبەلاحی مرۆ ترسێن

نەزا- کارێك وەدرەنگ کەوتبێ- چاوەڕوانی زۆر کردن لەکارێك

ئەرێ چیت بەسەر هات نەزا

نەژنەوا- مەردومی گوێ نەگر

نەساخ- درۆزن

نەکەس- ناکەس- ڕژد و چروك

نەمام کردن- کەسێ دەناو لای دیوار خستن و کوشتنی

میر کابرایەکی نەمام کرد

نەمرووت- زۆردار، زالّم

نەمرووتە- زۆردارە، زالمە

نەمرووتی- زۆرداری، زالمی

نەمرو نەژی- ژیان خەراپ

نەونەمام– تازە لاوی جوان

نەهات– بەدبەختی

نەهاتی و لێ قەومان هەردووکمانی کەنەفت و کەلەلا و پیرو زۆرهان کردبوو

شەرەف ل٦٤

نەهات– ساڵی وشک و بێ بارانی

نەهەنگ– زالم، زۆردار، رکۆنی

نەهەنگ– ئازا، رەشید، نەترس

نەهەنگە کێ دەرەقەتی دێ

نێر– ئازاو بەکار، مەردومی جوامێر، بوێر

.... پیاوێکی ئازاو دلێرو دەست و دڵ وازو جوامێرو سەرگەرم و بە زیپک و نێر بوە

شەرەف– ل٥٩٨

نێرانە– ئازایانە

نێر بدۆشە– کەسێ کەتۆ قسەی بۆ بکەیت و ئەو تێ نەگات و هەر سووربێ لەسەر قسەی خۆی

نێرە پیاو– پیاگی زۆر بەدەسەڵات و بەزاکون

نێرە ژن– زۆر ئازاو زانا

نێرەکەر– پیاوی ئازای بێ ئاوەز

نێرەکەری– زۆرداریی و بێ ئاوەزی

ئاسۆ بە نێرەکەری خانووەکەی داگیر کرد

نێرەکەرە– ئازایەو بێ ئاوەزە

نێوچەوان سیزدە– بە مەردومی دمۆر دەڵێن

نیزیک بوون– ئیلاقە کردن

نزیکی– ئیلاقە

کاکە نزیکی نەکەویتەوە
نیسک- ناراستو دوو ڕوو
نیسکی- درۆزنو دووڕووی

# "و"

وارکۆر– بێ عەولاد، وەچاخ کۆر

وارِ کردن– زارو زیچی زۆر خستنەوە

وازاڕی، بازاڕی– بێ نرخ، کەم نرخ، بێ؟قیمەت

واق– زیقەی منالْ

واوی دوی عەمر– کەسێ کە هەمیشە بەدوای کەسێکەوەیە

ورچە کولْە– بنیادەمی قەلْەوی کورتە بالاْ

ورچ و عەبا– کەسێ لەکارێك نەوەشێتەوە

ورد– بنیادەمی زرنگ و تەکووز، مەردوومی زیرەك

پیاوێکی وردە لەکاری خۆی

وردبین– بیر تیژو بەهۆش، کەسێك لەهەموو کارێکا ووردو زیرەك بێ

وردکردنەوە– روون کردنەوەی بابەتێك

وردە ئاهەنگ– تڕ– بای بەدەنگی پشتەوە، وردە بایەك کە لە هەندێ کەس دەبێتەوە

وردەبا– تڕوتس، باوبژ

وردەفرۆش– دوکانداری فەقیر

وردەو یەخسیر– گش لە گشتی بنیادەمو دارایی و زیندەوەر لە ئاواییدا هاتنە سەرمان وردەو یەخسیریان بردین

وەك بالْندەیەك کە لەڕکە بەردرابێ– مرۆی چەوساوە، کە چەوسانەوەی لەسەر لا کەوتبێ

ووردیی– باش بیرکردنەوە

وورگ دراو– زۆرخۆر

وڕوڕە– ژنی چەنەبازی فێلاْوی

وڕوڕەی جادوو– پیرێژنی بە فرت و فێلْ

وشتر خان– ئۆدەی زۆر گەورەو دیوار بلْند

وشترقین– بوغز له زگ‌و دەبنەوە بڕ
ووشك– رژد، چکوس، رەزیل
وشك– کەم دوو، کەم بڵێ، ئەو کەسەی زۆر تێکەڵ خەڵك نابێ
ووشك– ناتێگەیشتوو
ووشك– قسەی بێ ماناو ناڕەوا
وەلامێکی وشکی داینەوە
وشك بوون– تاسان، له جووڵەو بزووتن کەوتن
وشکه پیاوەتی– چاکه کردن هەر بەقسه
وشکه داوەت– هەڵپەڕکێ که ژنی تیا نەبێ
وشکه سۆفی– تەرکه دنیای نەزان‌و بێ سەلیقه
وشکه سەما– خۆ زۆر بەکەیف نیشاندان بەخۆڕایی
وشکەیی– مەرایی، لەگامی
وڵات– دەورو بەرو دارو دیوار
هەموو ولاتی پیس کرد، بەسەر وڵاتی دا مەریژە
وڵاخ– بەمرۆی بێ عەقل‌و ئەحمەق دەڵێن
وڵك بەساجەوه نان– جەرگ سووتان، تووشی دەردو ئازار کردن
وەبن– زیان
لەو سەودایەدا وەبن کەوتن
وەبن کەوتن، بەبن کەوتن– زیان کردن له سەودادا
وەتەنی– پارچەی هەرزان قیمەت
وەحشی، درندە– زاڵم، ستەمکار
وەرگەڕان– لەنێوچوونی پیاوی خاوەن پلەو پایه
یاخوا تەختت وەرگەڕێ
وەستا– لێزان، شارەزاله کارێك، کارزان
خۆت لەم کارانە وەستای
وەستایی– لێزانی، زیرەکی، کارزانی

بەوەستایە رۆشتم

ووشی لە دوو نەکردن، تۆز نەشکاندن- لەهەر بارێکی ژیاندا بیت نەگەیشتن بەکەس

ولاتل بەتیخ- شارو شوێنی بەیاساو قانوون، هەرکەس بۆ خۆی

وەلی- مرۆی بێ زیانوباش

"ه"

هات- بەختو تالح

هات- ساڵی زۆر بە دەغڵو دان

هاتنەبار. هاتنە بەربار، هاتنە خوار- سازانو رازی بوون، واز لە لاساری هێنان

هاتنەپێ- تووش بون

قەرزەکەم هاتۆتەپێ

هاتنە چۆك- بەزینو تەسلیم بوون

هاتنە خواری- قایل بون، رام بوون

لەکەری شەیتان هاتنە خواری

هاتنەژان- پێ ناخۆشبوون، لەلاناخۆشبوون

بەو قسانەی هەموو گیانم هاتەژان

هاتنە ژێربار- کەویبون، رامبون

هاتنە دەست- بەرگری لەخۆ کر ن

.... زۆر پیاوانە هاتە دەستو دەستو بردی کرد....

شەرەف ل٢٢٠

هاتنە سەرچۆك- بەزینو تەسلیم بوون

هاتنە سەرلا- بێعارو لاساری کردن

هاتنە سەرکلك- پەشیوان بونەوەی کەسێ لەکارێ

هاتنەلا- مردن

هار- پیاوی بەدفەڕو بەئازار

هار- مرۆی زیرەكو وریا

هار- ئۆقرە نەگر

هاربوون- بەدفەڕی

هارومار، مارومورر– هەموو شتێکی خرتو پرت
سەری هارو ماری هەیە
هاری– شەڕفرۆشیو ئازاردانی خەڵك
ماڤینا میر شەرەف– مانگی رەزبەر
هاڤینا ناوین– گەرمای زۆر
هالۆز– پیاوی بەدفەڕی شەڕانی
هامان– زۆردارو زۆرکەر
هام پیالە– دوستی گیانی
هام سەر، هاوسەر– ژن بۆ مێرد
هاوکاسە– دوستی نزیك
هاولان– دوو دۆست کە دایم بەیەکەوەن
هرمەت– ژنی بەمێرد
هلدێران– فڕێ دانی ماسك لەڕووی دووڕوو، ئاشکراکردنی درۆ
روێی وی هەلدێرا
هۆکردنەوە، هۆدانەوە– کەسێك یا شتێك لەکاتی پێویست سوودت بۆ دەدات
بارام هۆی دایەوە
هوونی– دوژمنی خوێنی
هەبوو، هەبون– دولەمەند، زەنگین
پیاوی هەبوە فەقیر نیە
هەبوونی– دەوڵەمەندی
هەپلەگون– بێ عەقل، ئەحمەق
هەتیوباری– نەداریو فەقیری ژنی بێ مێرد
هەتیم چە، هێتیم چە– پیاوی نانەجیبو بێ ئاکار
هەربلاندن– تێکدانی کار
هەرزان کر– (١) فەقیرو نەدار، (٢) رژدو چروك

هەڕو پڤ- تووڕە بوونی کە زوو خەلاس دەبێ
گوێی مەدەیێ تووڕەیی ئەو هەڕوپڤێکە دەبڕێتەوە
هەزار بەهەزار- شاخی زۆر بەرزو ئاسێ
هەزاری بەهەزاری- شوێنی زۆر قەرەبالغ
هەزار رەنگ- منداڵێ لە گانی حەرام پەیدا دەبێ
هەژار- مرۆی بێ ئازار
زۆر هەژارە کاری بەکەس نیە
هەژار- قسە نەزان و گێلۆکە
زۆر وەڕ نیە هەژارە
هەژان، شلەژان- تێك چوون
لەگەڵ ئەو خەبەرەی دنیا هەژا
هەسان- گاڵدان، دنەدان
هەسان لێدان- گالدانی کەسێ، دنەدانی کەسێ
هەستانەوە- بەرەنگار بوونەوە
دیسان لێمان هەستانەوە
هەستانەوە- دەوڵەمەند بوونەوە دوای نابووتی
هەست و نیست- هەموو دارایی مەردوم
هەست و نیستی محمودم بەدەستە
هەستی سڤیك، هەستی سووك، هێسك سووك- کەسی خۆشەویست لەناو کۆمەڵ
هەستی گران، هێسك گران- کەسێ لەبەر کاری ناهەموار نەچیتە دڵانەوە
هەستی کوژ- زۆرخۆر
هەس دانەوە- تەریق کردنەوە تەمێ کردن
زۆری ووت ئاخری هەسم دایەوە
هەش- نەبوون

بازار هەشە- هیچ شتێك نیە

هەش بەسەر، هەش وەسەر- بەدبەخت، کلۆڵ

کوڕێکی هەش بەسەرە

هەش بەسەر بوون، هەش وەسەر بوون- تووشی بەڵاو بەدبەختی بوون

هەش بەسەر کردن، هەش وەسەر کردن- تووشی بەڵاو چورتم کردن

هەش بەسەری، هەش وەسەری- بەدبەختی، کلۆڵی

بەهەش بەسەری کوڕەی گەورە کرد

هەفترو، حەفت ڕو- مەرایی کەر، ڕوویین

هەفترویی، حەفت ڕویی- مەرایی کەر

حەفت ڕویی کردن- مەرایی کردن

هەفتیار- ژنی دەگەڵ زۆران حەزلێکردویی دەکا

هەڤدەل- تێکەڵو پێکەڵیو چی بەسەر چیەوە

هەڤدەنگ، هاودەنگ- لەبیرو باوەڕ وەك یەك

هەڤدەنگی- دۆستایەتی گەرم

هەڤکێش- وێك چوونی ئاکاری دووکەس یا چەند کەس

هەڵ- گوزەرانو ڕابواردن- حەوانەوە

دەگەڵی هەڵ ناکەم، دەگەڵی هەڵکە

هەلال زادە- مرۆی زۆر بە پیاوەتیو دەمارو ڕاستگۆ

هەلال زادەیی- ڕاست گۆییو پیاوەتیو بەدەماری

هەڵایسان- شەڕوهەرا قەومان

هەڵایساندن، داگیرساندن، هەڵکردن- سازکردنی فیتنەو شەڕو شۆڕ

لەسەرتای ئەم چەرخە ئەڵمان دوو شەڕی گەورەی لە دنیادا هەڵایساند

هەڵایسێن- هۆی کێشەو هەرا

هەڵ برژان- خۆ دەگژ ڕاکردن

هەڵ پرووز- پەلەولەز، تەنگاو

هەڵ پڤان- تووڕە بوونو باكردن لە ڕكان

هەڵ پڤاندن- تووڕە كردن

هەڵ پەراندن- زۆر تەنگاو كردنی كەسێ بۆ كاری یاكردەوەیی

هەڵ پەرتاتن- ڕێكو پێك كردنی شتی نارێك

" ناوماڵەكە هەڵ پەرتێوە"

هەڵ پەسارتن- لەكارخستنو چاوەنۆڕ ڕاگرتن

هەڵ پەسێران- بێكار كرانو چاوەنۆڕ كران

هەڵچو- بێ فكر لەكاردا، لاسار

هەڵچۆ- كەسێ كاری سەربەخۆ دەكا

هەڵ چوون- تووڕە بوون

.... كوڕم تۆ هێشتا لاویو سەرت گەرمو زوو هەڵدەچی

شەرەف ل١٣٧

هەڵ خراندن- هاندانو فریودان

هەڵ خراو- فریودراو

هەڵدێر- تەنگو چەڵەمەی ژیان

تووشی هەڵدێرەكت نەكات

هەڵرشتن، هەڵریشتن، بە گۆری وەركردن- هەموو كارێكی نهێنی ئاشكراكردن

هەڵ سووڕاو- مرۆی بەكارو تێكۆشەر

پیاوێكی هەڵ سووڕاوە

هەڵ سووڕێن- كار پێك هێنەر

مام حەسەن كاروباری ئاغا هەڵ دەسووڕێنێ

هەڵسوكەوت، هەستانو ڕۆنیشتن، هەستانو دانیشتن- گوزەران ژیان لە گەڵ كەسێ بردنە سەر

هەڵسەنگان- ئەزموونو نرخ بۆ دانان

هەڵ قوچان- داخ خواردن، سوێ بوونەوە

هەڵ قرچاندن- خەم پێ دان، پەریشان کردن

جەرگە هەڵ قرچاندنی خەڵك باش نیە

هەڵ قرچاو- خەم خواردوو، پەریشان بوو

زگم هەڵقرچاوە

هەڵ کورمان- کزکردن لە لاپەڕو بن دیواران

هەڵ کورماو- مرۆی گوشەگرتوو لاپەڕ

هەگبەی بەتاڵ- کاربەدەست نەبوون، حوکم بەدەست نەبوون

هەڵ گرتنەوە- سزا وەرگرتن

ئەوا هەڵمان گرتەوە

هەڵ گەڕاندنەوە- پەژیوان کردنەوە

هەڵ گەڕانەوە- پەشیمان بوونەوە

هەڵگێرو وەرگێڕ- جوڵانەوە

پیربوە هەڵگیرو وەرگێری دەوی

هەڵ ماڵان- شەرم شکان

روو هەڵ ماڵان

هەڵ ماڵاو- شەرم شکاو

روو هەڵماڵاو

هەڵگیرسان- دەست پێ کردنی جەنگ‌و هەرا

هەڵگیرساندن- دامەزراندنی جەنگ‌و هەرا

هەڵمەتە کاسە- زۆرخۆری زگ لەوەڕێن

هەڵمەتە کاسە- مەردوومی خۆتێ هەڵقورتێن لە هەموو کارێکا

هەڵساندن- هوشیار کردنەوەی کەسێك لە کارێکی شاراوەدا

هەڵە سوون هێنانەوە- دووبارە داواکردن

بەشم داوە دیسان هەڵە سوونی هێناوەتەوە

هەلە سیابا- قەڵەوی تەمەڵ

هەڵۆ- مرۆی ئازاو چاو نەترس دەڵێن

هەڵۆکانی گەرمیان هەڵمەت بەرن

هەڵوەشاندنەوە- تێکدانی کارێك

هەڵەوەڕ- چەنەباز، چەقەسرۆ

هەمبانە بە گۆڕی وەرکردن- هەموو شتی ئاشکرا کردن

هەموو دەرگام بۆ کرایەوە- لەهەموو لایەك کارم جێبەجێ دەبوو بەبێ راوەستان

هەموو دەرگام لێ داخرا- (١) لەهەموو لایەك کارم توشی جێبەجێ نەکردن بوو،

(٢) لە هەموو لایەك توشی ناهومێدی بووم

هەناسەی بۆ کرۆزاوی هەڵکێشان- خەم خواردنی زۆر

هەڵاتن- تەواو کردن

شەرتم هەڵات پارەم دەوێ

هەناری شیرین- کەم خۆدەرخستن، وون بوونی کەسێ و نەدۆزینەوەی

هەناسە بڕین- کون بڕکردنی جیگایەك

هەناسەدان- کەمێك پشودان و حەسانەوە

دانیشە هەناسەیەك بدە

هەناسە سارد- (١) مەردومی کلۆڵی بەدبەخت، خاکەسەرو بێ کەس، (٢) ناهومێد

بەگلەری چەنبەری لەوڕێ گرتنەی لە هەناسە ساردو خوێنی گەرمی خۆی بەولاوە چی دەسگیر نەبوو

شەرەف ل١١٥

هەناسە ساردی- ناهومێدی

هەناسە سوار- قەلس بوو

هەناسە هەڵکێشان- خەفەت خواردن

نەوزاد هەر هەناسە هەڵ ئەکێشی

هەناو- ئازیز، خۆشەویست

هەناوم- ئازیزم

هەناو- هێزو توانا

کابرایەکی بێ هەناوە

هەناو بەربوونەوە، ناوسك بەربوونەوە، زۆر ترسان

هەناوم بەربۆوە- زۆر ترسام

هەناو پڕ خوێن بوون- زۆر غەم خواردن بەبەردەوامی

هەناو خواردن- هەراسان کردن- بێزار کردن

هەناوی خواردم- بێزاری کردم

هەناو ڕەش-مرۆی رکۆنی بەبوغز

هەناو رەش بوون- خەم خواردن لە شتی یا لە کەسێ

هەناو رەش کردن- خەمبار کردنی یەکێك- خەم پێ دانی زۆر

بە قسان هەناوی رەش کردم

هەناو کەوتن- ترسان، تاسان

لە گەڵ ئەو خەبەرەی هەناوی کەت

هەنگاونان- بەرەو پێش چوون

ئازاد هەنگاوی باشی نا

هەنگوستیلە- هۆ، وەسیلە

ئازاد هەنگوستیلەیە لە دەستم

هەنگوین- خواردن و خواردنەوەی زۆر شیرین

هەنگوین بەزار تاڵ کردن- هەنگوین و دۆشاو بەزار تاڵ کردن- گەڕو گیچەڵ هاڵندن لەکەسێ

هەنیە خۆش- بەڕێزو حورمەت

هەوا- فیزو غللور

هەوابڕ- دیواری خانووی بلند

هەوادار- بەدەعیە، بەفیز

هەوای توش- بشێوی‌و ناخۆشی

هەوایی- پیاوی کە لە کەیف خۆش دەگەڕیت

هەوسار لەسەر داماڵین- بۆ بەرەڵا کردنی کەسێ دەڵێن

هەویری ناو دەستان- هۆ، وەسیلە

ئازاد هەویرە لەناو دەستم

هەوراز لێکردن- کەسێ خۆی هەڵکیشی دانیشان بدات هەموو کارێکی لەدەست دێت

هەورو هێل- رۆژانی ناخۆش‌و پڕ لەئاژاوە

ئەو هەورو هێلە نەما

هەونێ سەران- خەوی زۆر درێژ خایەن

هەوێ- دوژن رقیان لەیەك ببێتەوە

هەیتە- بەژنی بێ شەرم‌و هارو ماج دەڵێن

ئامە هەیتە رۆژێك لەگەڵ مێردەکەی دەچێتە هەولێر

غەوارە ل١٦٤

هیچ- کەسێ لەبەر ئاکاری نابەچێ ناکەوێتە بەر دڵانەوە

هیچ نەچاندن- چاکەو پیاوەتی نەکردن لەگەڵ کەس

هند، هەند- قەدرو حورمەت

بەهندم ناگری

هێستر- جنێوە بەمانای ئەحمەق‌و بێ عەقڵ

هیشك بوونەوە- ڕەق‌و تەق‌و باریك بوونی گیاندار بە تایبەتی ئینسان لەبەر نەخۆشی یا برسیەتی یا خەمی زۆر

هێڵ- مایە فتنە، کەسێ شەڕ دروست دەکا

سەری هێلان ئەتۆی
هێنان‌و بردن– بەڵێنی بەدرۆ
هێنانە خوار– لە پلەو پایە لابردن

## "ی"

یاجوج با جوج- هەزار زیلە، خەڵکی زۆری تێکەڵو پێکەڵ

یاریکردن، گەمە کردن- تێك دانی یاساو دابو نەریتی خەلك بۆ سوودی تایبەت

یاری بە چارەنووسی خەڵك دەکات

یاری بەئاگر کردن، گەمە بەئاگر کردن- کاری ترسناك کردن

یاری بەعەقل کردن، گەمە بە عەقل کردن- پێ رابواردن

یاریکردن- کۆمەك کردنی کەسێ

یاسینی گۆلکێ- کاری بێ هودەو بێ سوودی درێژخایەن

بوە یاسینی گۆلکێ

یال گەنیك-کەچەڵ

یەتیمچە، هەتیمچە- رژد، چروك، خنس، نەدیدتکۆکە

یەخە دادڕین- وەڕسبوونو بەجێ هێشتنی کەسێك، خۆ لێ بێ بەش کردن

یەخەم لێ دادڕیوەو نامەوی

یەخە دادڕین- ڕسوا کردنی یەکێك

تۆ لەسەر ئەم کارە بێ یەخەت دائەدڕم

یەخە بەردان، یێخە بەردان- واز لێ هێنان

یەخە کێشیاگ- منالێکی بێگانە کە کردبێتت بە منالی خۆت

کەسێ کە پیاو بە فرزندەی قبولی دەکا

یەخە گرتن- دەمە قالێیو شەڕ پێ فرۆشتن، کێشە تێ هالان

یەخە گیراو- شەڕ تێ هالاو

یەخە گیر- کەسێ شەرت پێ بفرۆشێ

یەخە لەبەر دادڕین- زۆر بێزار بوون لە کەسێ

یەك- بێ فەرقو جودایی، تەبا، نێوان خۆش

ئەگەر ئێمە یەك بین کەس پێمان ناوەستێ

یەکەم- زۆر باش
کالایەکە یەکەمە
یەك پێ- زۆر بە خێرایی
"... دەبوو لەبەر هەموویان یەك پێ هەستم..."
هێمن- تاریك‌و روون ل٦
یەکە یەکە- هەڵبژاردە، ئازا، کۆك
زەلامی یەکە یەکەی لەگەل بوو
یەکانە- زۆر ئازا
یەکانەکانی کوردستان هێرش بەرن
یەك باد- مەردومی لاوان، مرۆی لاوازو باریك‌و بێ تین
یەکباڵ، تەنیا باڵ- مرۆی تەنیاو بێ یاریدەر
یەکپا- سەرسەختی، لاساری، سووربوون
یەکپا وستاوە هەر دەیەوی
یەکتر ماچ کردن- ئاشت بوونەوەی دوو کەس کە نێوانیان ناخۆش بوبێ
یەك رکێب، یەکسەرە- بێ وەستان
یەك رکێبی- یەکسەری
یەك رکێبی رۆیشت بۆ شاخ
یەك چاو- (١) یەکسانی، هەمووی وەکو یەك، (٢) بێ راپایی
من بەیەك چاو تەماشایان دەکەم
یەك چاوی- یەکسانی
یەکچاوبوونەوە- لاچونی راپایی‌و ساغبوونەوەی کار بەلایەکا
یەکدڵ‌و دەست، یەکدل‌و یەکبازوو- تەباو تفاق‌و یەك گرتو
کوردیش کە ببایە یەکدڵ‌و دەست          دەستیان دەکەوت ژیانی سەربەست
شەرەف ل٣٦
یەك دەستی، یەك دڵی- تفاق، یەکیەتی

یەکدەنگ– هاوهزر، هاوبیر

یەك دەنگن و یەك رەنگن و لەرۆژی هەراو جەنگدا هەموو شان بەشانی یەك دەوەستن

یەك رەنگ– تەباو تفاق و یەك گرتو

یەك رەنگ– مرۆی راست و بێ مەرایی بێ گزی

یەك رەنگی– راستی و دروستی

یەك روویی– راستی و دروستی

یەك روو– مەردومی بێ ریاو بێ درۆ، مەرایی نەکەر

شاعیرێکی راست و یەکڕووم و فیداکارو نەبەزم

کوردە موحتاجی محەك نیم زێری بێ غەلل و غەشم

هێمن– تاریك و روون ل١١٥

یەك زمان– بەئاشکرا

یەك قسە– خاوەن بەڵێن، خاوەن هەرێ

یەك ماڵ– دوستی گیانی

من و تۆ یەك ماڵین

یەك ماڵی– تێکەڵی دووکەس کە درێغیان لە یەك نەبێ

یەك نەفەس– بێ راوەستان و پشوودان

ییخ بوون– دانەواندنی هەمبەر لە کێشەدا واتا– تەسلیم بوون

ییخ خواردن– دانەوینەوە

هەر دەستم بۆ برد ییخی خوارد

ییخ کردن– سەر پێ دانەواندن

# سەرچاوەکان

| ز | سەرچاوەکان | کورت کراوەی سەرچاوەکان |
|---|---|---|
| ١. | ئەفسانە- کۆر نۆغلی- یەشار کەمال- شوکر مستەفا کردویە بەکوردی | کۆر نۆغلی |
| ٢. | برایم زەبۆک"چیرۆک- عەزیز نەسین" وەرگێرانی سعید خەتات | زەبووک |
| ٣. | بۆرەی قەپلانی- رۆمان- بۆ مێرد منداڵان- نووسینی عەزیزی مەلای رەش | بۆرە |
| ٤. | پێکەنینی گەدا- چیرۆک- حەسەنی قزلجی | گەدا |
| ٥. | پەندی پێشینان- شێخ محمدی خاڵ | خال |
| ٦. | تاریک‌و رون- شیعر- هێمن مهابادی | تاریک‌و روون- هێمن |
| ٧. | تونێشەبەرەی هونەری مامڵێ- نوسین‌و ئامادەکردنی سمایلی مامڵێ | |
| ٨. | داستانی دم دم- نووسینی عەرەب شەمو وەرگێرانی شوکر مستەفا | دم دم |
| ٩. | دیوانی شیعری محمد سالح دیلان | دیلان |
| ١٠. | رەوانبێژی- عەزیز گەردی | - |
| ١١. | ژانی گەل- رۆمان- نووسینی مامۆستا ابراهیم ئەحمەد | ژان |
| ١٢. | سەرچاوەیەکی ژانێکی خامۆش- شانۆگەری- نووسینی ئەمین میرزا کەریم | سەرچاوە |
| ١٣. | شەرەف نامەی شەرەفخانی بەدلیسی- هەژار کردویە بە کوردی | شەرەف |
| ١٤. | غەوارە- رۆمان- نووسینی عەزیزی مەلای رەش | غەوارە |
| ١٥. | فەرهەنگی خاڵ- شێخ محەمەدی خال- ٢- بەرگ- کوردی- | |

| | | |
|---|---|---|
| | کوردی | |
| ۱٦. | فەرهەنگی مەهاباد- گیوی موکریانی- کوردی - عەرەبی | |
| ۱۷. | فەرهەنگی هەمبانە بۆرینە- نووسینی هەژار- کوردی- فارسی | بۆرینە |
| ۱۸. | قاموسی زمانی کوردی- بەرگی یەکەم و دووەم- نووسینی عبدالرحمن محمد امین زەبیحی | زەبیحی ب۱- ب۲ |
| ۱۹. | کوێرەوەری- چیرۆک- نووسینی "بله" | کوێرەوەری- کەرەلووت |
| ۲۰. | گێلە پیاو- عەزیز نەسین- چیرۆک- وەرگێڕانی عبدالله ی حەسەن زادە | گێلە |
| ۲۱. | گورگ و بزن- رۆمان- عەزیزی مەلای رەش | گورگ و بزن |
| ۲۲. | فەرهەنگی ئاری- سابر گرد عازەبانی | ئاری |
| ۲۳. | قاموسی کوردی- ئینگلیزی | |
| ۲٤. | فەرهەنگی گەرمەسێر- نووسینی علی سایە- کوردی- ئارەبی | گەرمەسێر |
| ۲۵. | هەمیشە بەهار- نەژادو فەرەیدون- شیعر- نووسینی مەدهۆش | هەمیشە بەهار |
| ۲٦. | یاداشتی- رەفیق حیلمی | یاداشت |
| ۲۷. | ئاشتی بۆ کوردستان- چیرۆک- نووسینی محمد صالح سعید | ئاشتی |
| ۲۸. | حاجی ئاغا- نووسینی سادقی هیدایەت- وەرگێڕانی عبدالقادری دەباغی | حاجی ئاغا |
| ۲۹. | هەندی دادوەری بەناوبانگ- جەمال بابان | دادوەری |
| ۳۰. | رۆمانی شار- چیرۆک- نووسینی حوسێن عارف | شار |
| ۳۱. | هۆزی لەبیرکراوی گاوان- وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە بۆ کوردی مامۆستا هەژار | هۆز |